ناوی کتێب: ترحێو
ناوی نووسەر: کەمال سەعدی مستەفا
پیت چنین: نوسینگەی گۆڤار بۆ کومبیوتەر
تیراژ: (1000) دانە

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر

مووچە خۆرێکی بچووک بوویت.. مووچەکەت هێندە کەم بوو بەشی خەرجی مانگێکی بەتێری نەدەکردن.. نانی شێوانت واز لێ‌هێنا گوایا ڕێجیم دەگەی سەرەڕای ئەوەش ئینجا بەتەقەتەق دەگەیشتی‌یە سەری مانگ..

چەند جارێک ژنەکەت زیزبوو. داوای کرینی موجەمیدەی لێ دەکردیت دەیووت:

- ژنی خەڵکی هی دوێنێ ئەو ماڵیان هەموو شتێکی تیایە بگرە لەسەلاجەوە تا دەگاتە موجەمیدەو تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ و جلک شۆری کارەبایی تەنیا من ئەبێ بەختم ڕەش بووەو تووشم بەتووش ناکەس بەچەیەکی وەک تۆ بووەو بە پیکی سالانی پێشوو لێ دەدەی.. دەڵێی ماڵی سواڵکەرە، هیچی تیا ئی‌یە، دەیان قسەی تریش.

مێشکی کون کردبوویت، دەتویست وازی لێ‌بهێنیت لەبەر خۆتەوە دەتووت.

- حەوت سەر منداڵ بەدەم خۆشە.. ئەگەر دەستی لێ‌بەربدەم جارێکی‌تر کێ ژنم دەداتێ.. ئەگەر داشیان بەچی بێنم کە فلسێکی سووری پاشەکەوتم نەبێ..

بریارتدا داواکانی بەجێ بهێنیت و خۆت لەم گێژاوە ڕزگار بکەیت.. ئەمری خوا رەزای حەق.. دانیشتنێکی دوو قۆڵیتان بۆ کرد. دوای مشت و مڕێکی زۆر لەسەر کرینی موجەمیدەیەک ڕێ‌کەوتن دوا بەدوای ئەویش چەند شتێکی تری ناو ماڵ.

بریار دەرکردن زۆر ئاسانە جێ بەجێ کردنی زەحمەتە.. ئەو شەوەیان تا بەیانی نەخەوتی. دەستت خستبووە ژێر چەناگەت و بیرت دەکردەوە.. شت بەقەرزدانیش باوی نەماوە، تۆش کە عانەیەکی قەڵپت نەبێ بەچی موجەمیدە دەکڕی.. دەیان بیری جۆراو جۆر لەناو مێشکت جەنجاڵیان دەدا.. لەناکاو ڕاپەڕیت، لەقاقای پێکەنینتدا.. ڕەحمەی ژنت لەخەو ڕاچڵەکی ڕووی تێ‌کردیت وتی:

- مردووت مرێ ئەوە تۆی؟! زەندەقت بردم وتم داخوا دەبێ چی بێ.. شێتیش واناکا بەچی پێ دەگەنی؟!

خۆت تێک نەدا.. لێی چوویتە پێشەوە، بەزەردەخەنەیەکەوە وتت:

- ئافرەت دۆزیمەوە.
چەپەلۆکێکی پێدا کێشایت و بەتوورەیی‌یەوە وتی:
- چیت دۆزیوەتەوە؟! ناکات بڵێی کووپەی زێرم دۆزیوەتەوە؟!
ووتت:
- بیری پەیداکردنی پارەی موجەمیدەکەم دۆزی‌یەوە.
وتی:
- توخوا ئەمەش بۆقسە!!
ڕووی خۆی وەرچەرخاندو بەپرتەپرت و بۆڵە بۆڵ خۆی خستەوە ژێر بەتانی‌یەکە.
سەری مانگ لەگەڵ چەند فەرمانبەرێکی دائرەکەتان کۆمەڵەیەکتان پێکەوەنا یەکی دە دینارتان بەلاوەنا، دوو سەد دیناری خشتی لێ دەرچوو.. ناوتان لەسەر پارچە کاغەزی بچووک نووسی، خستتانە ناو زەرفێکەوە بۆ ڕاکێشانی ناوی یەکەم بەش .. دڵت وەکو ماشێن لێ‌ی دەدا، تارەقەت لەکشت لەشت بەردەردابوو.. چاوت بڕی بووە زەرفی ڕاکێشانەکەو لەبەرخۆتەوە دەتووت:
- تاقە هیوام ئەوەیە.. ئەگەر بۆم دەرنەچێ قوڕی دونیام دەکرێ بەسەردا. لەدەستی ڕەحمەخان ڕزگارم نابێ.
دەست خرایە ناو زەرفەکە، یەکەم ناو ڕاکێشرا.. چاوەکانت وەکو دووربین لێ‌کردبوو.. لەگەڵ دیتنی ناوت بەڕێنێک خۆت هەڵدایە ئاسمان، دەستت بەچەپڵەلێدان و سەما کرد. واقیان ورما.. بەسەر سوورمانەوە وتیان.
- بێ‌قەزابیت دەڵێی بیتاقەی یانەسیبت بۆ دەرچووە! ئەمە ئەوەندە دەهێنێ تۆ وای بۆ بکەی؟!
وتت:
- ئەگەر ئێوەش لەجێ‌ی من بوونایە لەمنیش خراپترتان دەکرد.. خوا بەخۆی دەزانێ ڕەحمە چ ماڵێکە!!
هەر لەو ڕۆژەوە دوو سەد دینارەکەت خستە گیرفان، ئێواران فیتە بەدەورەیەکی بازاڕت بۆ دەکرد، دوکان بەدوکان دەگەڕایت.. موجەمیدەت بەو نرخە دەست نەکەوت.. بازاڕی ڕەش خۆش بێت خۆی لە دووقات دەدا.. بێ‌هیوا بوویت.. بیری

بەپاکردنی پارەی ترت دەکردەوە کرینەکەت بێئەنجام دەدیت .. ئێوارەیەک لەناو بازار دەخولایتەوە، موجەمیدەیەکت بەرچاو کەوت، ویستت لێی لادەی، کە چاوت بەنرخە کەمەکەی کەوت هەڵوێستەیەکت کردو گەڕایتەوە سەری.. کاغەزێکی لەسەر دانرابوو، بەگەورەیی لێی نووسرابوو (بیکڕی پەشیمانی.. نەیکڕی پەشیمانی).

سەرەتا کەیف خۆش بوویت. دەستت بردەوە باخەڵت. ویستت پارەکەی بۆ دەربهێنیت کەچی دەستت چەقی و کەوتیتە بیرکردنەوە لەبەر خۆتەوە دەتووت:

- خاوێن دیارە، لەوە ناچێ هیچ خەوشێکی هەبێت کەچی ئەم نووسینەشی لەسەر داوە، تۆ بڵێی بیکرم و پەشیمان ببمەوە؟!

زۆر بیری ترت بەخەیاڵدا دەهات.. لەخاوەنەکەی چوویتە پێش و پێت وت:

- نیازی کڕینی ئەم موجەمیدەیەم هەیە بەڵام..

قسەی بڕیت وتی:

- دەزانم! دەتەوێ بڵێی ئەگەر بیکڕم بۆ پەشیمان دەبم، وا نی یە ؟!

بەسەر سوورمانەوە پێت وت:

- ئەوە چۆن زانیت؟

وتی:

- چۆن نازانم! بۆیە وام نووسیوە تا کەس بە ئاسانی خۆی لە کڕینی ئەم موجەمیدەیە نەدات..

پێت وت:

- چۆن پارە بەشتێک بدەم و تێی نەگەم.

وتی:

- وەکو خەڵکی ئەم شارە فێری قۆڵ بڕین و فروفێڵ و کەلەکەبازی نیمە..

- خۆت دەزانی ئیمرۆ هەموو بازار بگەڕێیت موجەمیدەیەکت بەم نرخە دەست ناکەوێ بەڵام والێرە بەچاوی خۆت دەی بینیت و بەمەرجیش دەیفرۆشم.

هەناسەیەکت هاتەوە بەرو شاگەشکەبوویت.. پارەکەت لە باخەڵت دەرهێنا، لەسەر مێزەکەییت دانا وتت:

- دیارە مرۆڤی خێرخواز هێشتان ماوە.. ئێستا دڵنیا بووم، ترسم لێی نەما..

بەڵام بابزانم ئەو مەرجە چی‌یە؟ بەزەردەخەنەوە وتی:

– ئاوە ئاوە فیکەیەک لێ دەدا.. مەترسێن هیچ نی‌یە تۆزێک ڕۆنی ماشێنی تێبکەن خۆی وردە وردە کەم دەبێتەوە تا بەتەواوی ئامێنێ..

وتت:

– بەس ئەوەندە؟!

دەستی لەسەر کەشیدەی دانا وتی:

– ماڵی خوام دیوە، نانی خۆم حەرام ناکەم، دەبوو ئەم خەوشەت پێ بڵێم.

سەیرێکی نووسراوەکەی سەر موجەمیدەکەت کردەوە، لەبەر خۆتەوە وتت هەر دەیکڕم، خۆ ڕەحمە دەڵێ موجەمیدەی بۆ کڕیوم. پارەکەت وێرکرد. ناوی خوات لێ‌هێناو بردتەوە.

ئەو ڕۆژەیان ڕەحمەت بکوشتبا دەنگی لەگەڵ نەدەکردیت.. ناوت بهێنابا بە گیان گیان و بەساقە وەڵامی دەدایتەوە.. ڕەحمەی جاران نەبوو، دەتووت گۆڕاوە، تۆش دۆش دامابوویت وەختا بوو دڵت پەق بەرێ.. بیرت هەر لای پارچە نووسینەکە بوو، نەشت دەوێرا بەڕەحمە بڵێی نەک خوا نەخواستە لەکار بکەوێت و داوای یەکێکی ترت لێ بکا..

بۆ بەیانی هێشتا خێرو شەڕ دابەش نەکرا بوو، ڕەحمە گەیشتە سەرت، خۆی خستە باوەشت و بەزەردەخەنەیەکەوە وتی:

– پیاوەکە دەبێ هەندێک شتوومەکیش بکڕیت تا ناو موجەمیدەکەمان بەتاڵ نەبێ.

بەتووڕەیی‌یەوە وتت:

– نۆرەی ئەم قەوانەیە.. بۆ ناو سەلاجەکەمان پڕ بووە تا نۆرەی ئەمە بێت!!

وتی:

– خۆ چارچێوک نین هەروا بەبەتاڵی بیهێڵینەوە.. یەکێک ببینێ چیمان پێ دەڵێ.. هەر دەبێ پڕی بکەینەوە.. سەری خۆت لەقاندو چوویتە دەرەوە.

زۆرت بیرکردەوە لە سەموونی ئیعاشە هەرزانترت دەست نەکەوت نیوەڕۆ بەتووڕەگەیەک سەموو هاتیتەوە.. پرتەو بۆڵەی ڕەحمەت لەکۆڵ بووە.

سەرت بەژووری مووبەقدا کرت تاکو موجەمیدەکە بەسەر بکەیتەوە هەر لەدوورەوە دەنگی ماتۆڕەکەی وا دەهات دەتووت کۆنە ناشە دەگەڕێ .. لێوی خۆت گەستەوە، لەبەر خۆتەوە وتت:

- ئەمەمان خەوشێک!!

سەرەتای پەشیمان بوونەوەت لێرەوە دەستی پێکرد .. لەو ڕۆژەوە گومانت لێ ی پەیداکردو دڵت ئۆقرەی نەگرت.. چاوەکانت وەکو زەڕەبین لێ کرد لەخەوشە شاراوەکانی تری دەگەڕایت..

گلۆپی ئۆتۆماتیکەکەی نەدەکوژایەوە.. چەند سەعاتێک ئیشکگریت بۆ کرد تابەتەواوی بۆت روون بۆوە ئۆتۆماتیکەکەی ئیش ناکات سەرت لەقاندو ووتت:

- ئەمەشمان خەوشی دووەم: خوا بزانێ سێیەم و چوارەمیش چی دەبێ!

شەوێک هەمووتان لەژووری تەنیشت مووبەقەکە خەوتبوون، لەناکاو دەنگی فیکەیەک هات.. هەندێک خۆت هێناو برد سەیری دەورو بەری خۆتت کرد.. هیچت بەدی نەکرد.. خەوتیتەوە.. فیکەکە زیاتر بوو.. بەرز بۆوەو رانەوەستا.. ڕەحمەو منداڵەکانت هەریەک بەلایەکدا دەرپەڕین و خۆیان بەدیوارەکەدا لکاند.. واتزانی سافیرەی ئاگادارکردنەوەیە ویستت بۆ ژێر پێپلقانەکە ڕابکەی بیرت کەوتەوە مەرجەکەیەو هاتۆتە دی.. هێمن بوویتەوە.. دەستی منداڵەکانت گرت و رووت لە ڕەحمە کرد وتت:

- مەترسێن فیکەی موجەمیدەکەی خۆمانە لەیادم چوو پێتان بڵێم.

پڕی گوێتان لۆکە کردو لێ ی خەوتنەوە..

بەیانی زوو لەگەڵ شیرەی نێرەکەر، ڕەحمە دەستی بەهاتوو هاوار کرد، لەخەو بەناگای هێنایت، هەزار پرتەو بۆڵە بەفلسێک کارگەیی یە نەوە موجەمیدەکە لەکار کەوت!! کەوتیتە بریکردنەوە.. لەبەر خۆتەوە دەتووت:

- قوڕم بۆ گیرایەوە، خێری دوو فلسی قەڵیم لێ ی نەدیت دەشبێت مووچەی ئەم مانگەشی لەسەر دابنێم.. چەند جارێک بردتە سەر وەستا.. جارێک ئۆتۆماتیکەکەیان گۆڕی گوایا بەوە چاک دەبێتەوە.. جارێکی تر پانکەکەی.. تاقم وایەری بۆ دووا جار ماتۆڕەکەیان گۆڕی.. مووچەکەت بەتەواویی لەدەست وەستا

کردو لەسەریشی قەرزار بوویتەوە..

موجەمیدەکەت بردەوە مالێ.. جاران ئاسایی داتگیرساندەوە دەنگی دەهۆڵ لێدان و فیکە فیکەی نەمابوو.. لەسەرەتا زۆر دلخۆش بوویت.. هەناسەت ڕاگرت.. پێکەوتی ئەمجارەیان بەتەواوی لەکار کەوت..

خەمی موجەمیدەکەت زۆر گران بوو.. لەویش زیاتر چۆنیەتی دانەوەی قەرزو ڕاستکردنەوەی باری گوزەرانت بوو..

زۆرت بیرکردەوە.. لەبەر خۆتەوە وتت:

- باشتر ئەوەیە هەر لەبەیانییەوە چەند قالبێک سەهۆڵ و سنووقی بیبسی کۆلای بخەمە ناو کورە گەورەکەشمی لەسەر داینێم ساردی بفرۆشم موجەمیدەی خەلک بەکارەبا ئیش دەکات باهی ئێمە بە سەهۆڵ کاربکا..

ماوەیەکی زۆر بوو خۆشی دەویست. وای هەست دەکرد ئەویش خۆشی دەوێ، جار جار لێی نزیک دەکەوتەوە و دەکەوتە دەمەتەقێ لەگەڵی. جڵەوی خەیاڵی بەرەڵلا دەبوو، دەکەوتە مەلەوانی، لەدەریای چاوە جوانەکانی.

زۆر جار دەیویست خۆشەویستی‌یەکەی بۆ بدرکێنێ، لەو دوو دڵی‌یەی تیایەتی خۆی رزگار بکا. بەڵام جورئەتی نەدەکرد لەبیری خۆی دەیووت: تۆ بڵێی ناشیرینی لووتم نە بێتە کۆسپ لەڕێی ئەم خۆشەویستی‌یە؟!

هەموو بەیانی‌یەک پێش چوونە کۆلیج، بەرامبەر ئاوێنەی ژووری نووستن دەوەستا، بە ووردی دەیڕوانی‌یە لووتە شکاوەکەی. زۆر خەمی لێ‌دەخوارد، لەبەر لووتی نەبووایە لە بەژن و باڵاو قیت و قۆزییدا هیچ خەوشی نەبوو. خووی بە کۆکردنەوەی وێنەی لووتی جوان بوو، ئەلبوومێکی لە لووتی قرتاووی ناو گۆڤارو ڕۆژنامەکان پێک هێنابوو.

زۆر جار خۆی پێ‌یەوە خەریک دەکردو لەگەڵ دیمەنی لووتەکەی خۆی بەراووردی دەکردن و لەبەر خۆیەوە دەیووت: ئەگەر بچمە لای پزیشکێکی نەشتەرگەری، بێ‌گومان لووتم جوان دەکا. ئەوکاتە هیچ خەوشێکم نامێنێ، دەتوانم ڕوو بە ڕووی ببمەوەو خۆشەویستی خۆمی بۆ بدرکێنم. بێ‌گومان ئەویش دەستەکانم دەگوشێت و ڕازی دڵی خۆیم بۆ دەردەخا.

دوا ساڵی خوێندنی بوو، دەبووایە لەو ماوەکورتەی کە مابوو شتێک بکات. بڕیاریدا پزشکێکی نەشتەرگەری بەسەر بکاتەوە و جوانکردنی لووتی ئەنجام بدات.

سەری بە عیادەی زۆربەی دکتۆرە تایبەتی‌یەکان داگرت، هیچی بە هیچ نەکرد. دەستی نەبوونی بشکێت، داوای پارە و پوولێکی زۆری‌یان دەکرد. ئەخۆشخانەی گشتی‌ی ناوەکەی بەخۆی وەیە، بەهەڵی زانی ئەوێش تاقی‌بکاتەوە. نقومی دەریای خەیاڵ ببوو. لەبیری خۆی دەیووت: تاقە هیوام ئێرەیە. تۆ بڵێی بەزەیی پێم ئەیەتەوە و چارەم ئەکات. هەر بەخۆی ڕەتی خۆی دەدایەوە و دەی ووت: خۆ من ئەخۆش نیم، هەتا بەزەیی پێم بێتەوە و چارەم بکات. بۆ داوای شتێکی وا هاتوومە مەگەر دەوڵەمەند بیری لێ‌بکاتەوە! لەگەڵ ئەماتەش دەیان بیری تری بە خەیاڵدا دەهات.

دکتۆر ڕووی تێ‌کرد و ووتی: ڕۆڵە ئەخۆشی‌یەکەت چی‌یە، بۆ قسە ناکەیت؟ دەمی

تێک ئاڵا، نەیزانی چی بڵێ. دیسان دکتۆر لێی دووبارە کردەوە. ئارەقەی سوور و شینی بەدەردابوو، تینی دابەرخۆی و بەشەرمەوە ووتی: لووتم. دکتۆر ووتی: لووتت چی‌یەتی؟ ووتی: دکتۆر ناشیرینە.

دکتۆر ووتی: ئەوجا چی‌یە، جوانی بۆ ئافرەت هاتووە نەوەک بۆ پیاو، جوانکردنی هیچ پێویست نی‌یە، ئەگەر هەر بشتەوێ بیکەیت، دەتوانی بچیتە لای دکتۆری تایبەتی.

پشتی لە دکتۆر کرد و بە نائومێدی‌یەوە بەرەو دەرگا ڕۆیشت. کە گەیشتە ناو دەرگا، ئاوڕێکی لە دکتۆر دایەوە و دوو دڵۆپ فرمێسکی زیوی‌ی ڕشتە خوارەوە.

دکتۆر لەگەڵ دیتنی ئەم دیمەنە هەستی بزووی. هەستایە سەر پێ و دەستی سۆزی بۆ درێژ کرد و دای نیشاندەوە و پێی ووت: ڕۆڵە شەرم مەکەو پێم بڵێ، بزانم بۆچی ناشیرینی لووتت لێ بۆتە گرێ‌کوێرە؟

شەرم دایگرت. ویستی قسەیەک بدۆزێتەوەو ڕاستی‌یەکەی پێ نەڵێ. لەدەمی دەرچوو ووتی: دکتۆر خۆشم دەوێ.

دکتۆر زیاتر لێی چووە پێشەوە و دەستی خستە سەر شانی و ووتی: ئێمەش وەکو تۆ خۆشەویستی‌مان کردووە، ئێستاش هەموو خەڵکمان خۆش دەوێ.

رووی لە دکتۆر کردوو ووتی: ئەو کچەی خۆشم دەوێ زۆر جوانە، هەتاکو خاوەنی ئەم لووتەبم، جورئەت ناکەم هەگبەی ڕازەکانمی بۆ هەڵبڕێژم. دکتۆر بەپێکەنینەوە پێی ووت: مادام ئەو کچەت ئەوەندە خۆش دەوێ، جوانکردنی لووتت بەمن گەیشت.

دوایی پێی ووت: لەهەفتەی دادێ پلانی نشتەرگەری دادەنێم و شێوەی چەند جۆرە لووتێک دەکێشم. ئەوکاتە کامیانت بەدڵ بوو ئەویانت بۆ جێ‌بەجێ دەکەم.

ئەو حەفتەو چەند حەفتەیەکی تریشی بەڕێ‌کرد بە کۆمەڵێک هیواوە گەڕاوە لای دکتۆر. پسوولەیەکی بۆ نووسی و ڕەوانەی نەخۆشخانەی کرد بۆ خەوتن و ڕۆژی نشتەرگەریەکەشی بۆ دیارکرد.

چووە نەخۆشخانە، لە سالۆنێکی گەورەی بیست نەفەری جێگایان بۆ کردەوە. هەندێک لە نەخۆشەکان وەکو ئەو تازە خەوتبوون و چاوەڕێی ڕۆژی نشتەرگەری‌یان دەکرد، هەندێکی تریشیان نەشتەرگەریەکەیان بۆ کرابوو، لووتیان بەلەفاف و کۆنکریت داپۆشرابوو.

بە بینینی ئەو ژمارە نەخۆشانە، شاگەشکە بوو، بزەیەک هاتە سەر لێوەکانی و لەبیری خۆی ووتی: دیارە ئەوانەش وەکو من دڵدارن، خۆشەویستی پاڵی پێوەناون خۆیان بخەنە بەر چەقۆی دکتۆر.

رووی لە نەخۆشەکان کرد. یەک لەدوای یەک لەهۆی نەشتەرگەریکردنی لووتیانی پرسی. یەکییان ووتی لەبەر جیوبی لووت و یەکێکیتر لەبەر گیرانی کونە لووت.. چەماوەی لووت... نەبوونی کونە لووتێک لە زگماکەوە... بۆ دەرمانیش یەکی تیانەبوو لەپێناوی خۆشەویستەکەی خۆی خستبێتە نەخۆشخانە. لەبیری خۆی ووتی: دیارە هیچیان فێری خۆشەویستیی نەبووتە!

ئەو شەوە هیچ خەو نەچووە چاوەکانی، ئاوێنەیەکی بچکۆلانەی بەدەستەوە گرتبوو و سەیری لووتی خۆی دەکرد و لەبیری خۆی دەیووت: لووتم نەشتەرگەری بکرێ رێک و پێک دەبم، خەوشم نامێنێ. ناوە ناوە پێلووی چاوەکانی دەکەوتنە سەریەک و لەخەوان دەپۆرژایەوە و باوەشکی دەهاتێ.

دکتۆر لە ژووری مومیاکردن دەخولایەوە، لاشەی مردووەکانی هەلگێرو وەرگێر دەکرد و کامە لووتی جوان بوو لێی دەکردەوە. هەموو لووتەکانی لەسەر مێزێک دانان و بەرامبەرییان دانیشت و دۆش داما. ئەویش رووی لە دکتۆر کرد و پێی ووت: دکتۆر ئەو لووتانەت بۆچی رێزکردووە؟ ووتی: دەمەوێ لەناو ئەم کۆمەڵە لووتە، لووتێکی جوان بۆ تۆ هەڵبژێرم لەگەڵ شێوەت بگونجێ. لەقاقای پێکەنینیدا. ویستی قسەبکات سستەر بانگیکرد. کە چاوەکانی کردەوە لەسەر تەختەی نووستنی قاوشەکە خۆی بینییەوە.

بۆ ژووری نەشتەرگەریان برد. بەنجی گشتییان لێداو نەشتەرگەریەکەیان بۆی ئەنجامدا.

کاتێک وەئاگاهات خۆی لە نێو نەخۆشەکان بینییەوە. دکتۆر و سستەرێکی شۆخیش بەدیار سەرییەوە بوون.

دەستی بۆ لووتی بردەوە، لووتی بە لەفاف داپۆشرابوو. چاوی هەڵبڕی، رووی لە دکتۆر کرد و پێی ووت: دکتۆر ئەوجا لووتم جوان دەبێ؟ دکتۆر وتی: بێگومان.

بە دکتۆری ووت: کەی دەتوانم جوانی لووتم ببینم؟ دکتۆر بە زەردەخەنەیەکەوە پێی ووت: دوای دووحەفتەیتر کە هاتیتەوە، لەفافەکەت بۆ لێ دەکەینەوە و فتیلەکەی ناوی دەردەهێنین ئەوکاتە زۆر بەجوانی دەتوانی سەیری لووتت بکەیت و بە جوونەت نهێنی دڵت بۆ خۆشەویستەکەت بدرکێنی!

لەماوەی ئەو دوو حەفتەیەدا بیری ئەوەی دەکردەوە، چۆن دەچێتەوە کۆلیج و خۆشەویستەکەی بەسەرسامی سەیری دەکات و گومان لە ناسینەوەی پەیدا دەکا، ئەویش لێی دەچێتە پێشەوەو خۆی لێ ئاشکرا دەکات.

ئەو رۆژەی رۆیشتەوە لای دکتۆر بۆ لابردنی لەفافەکەو دەرهێنانی فتیلی ناو کونە

لووتی، دڵی وەکو سەعات لێی دەدا. پێکەنین و گریانی تێکەڵ بەیەک ببوون. فرمێسکی شادی دڵۆپ دڵۆپ بەسەر ڕوویدا دەتکایە خوارەوە. بەرامبەر ئاوێنەیەکی گەورە ڕاوەستابوو، بەچاوێکی پڕ لە هیواوە دەیڕوانییە دەستەکانی دکتۆر.

دکتۆر دەستی کرد بەلابردنی لەفافەکە تا بەتەواوی لووتی بەدیار کەوت.

کە لووتی خۆی بەوشێوەیە بینی لەتاوان دڵی بوورایەوە و کەوتە خوارەوە. هەندێک ئاوی یان بەدەم و چاوی داکرد و یەک دوو زلەی نەرمیان بە ڕوومەتی کێشا. بەخۆی هاتەوە.

دکتۆر ڕووی تێ کردو ووتی: دەزانم لەخۆشی یان دڵت بوورایەوە! سەری خۆی لەقاندو بە عادزی یەوە ووتی: نەخێر! ئەگەر دەمزانی هەروەکو خۆی دەمێنێتەوە چۆن دوو مانگ هات و چۆم بۆی دەکرد و ئەو هەموو ئێش و ئازارەشم دەچێشت!! دکتۆر بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی: تۆزێک گۆڕاوە، ئەم جۆرە نەشتەرگەریانە بەجارێک و دووان ئەنجام نادرێن. کۆمەڵێک نەشتەرگەری دەوێ هەتا بەتەواوی شێوەی لووت بگۆڕێ. لەم نەشتەرگەرییەدا بە ئێسقان کۆڵەگەیەکم بۆ لووتت دروست کردووە لە نەشتەرگەری دووەمدا دیوی دەرەوەی دەتاشین. بەیانی بە پەشێوی و خەمناکی یەوە چووە کۆلیج. دووحەفتە دوورکەوتنەوە لە قوتابییان ماوەیەکی کەم نی یە. وەکو شانە هەنگ دەوریان داو لە حالیان پرسی. کۆمەڵێک پرسیار بەجارێک شالاویان بۆی برد. کە لووتت خەوشی ناوەوەی نەبوو بۆچی خۆت خستەژێر چەقۆی دکتۆر... ئیشت نەبوو ئیشت بۆ خۆت دۆزی یەوە... نازانیت ناو لەم کارەی تۆ بنێین چی؟

ئاسۆی هاوڕێی دەستی بۆ قوتابی یان درێژکرد و ووتی: پەلەمەکەن، بزانین خۆی دڵێ چی؟

ئەویش چاوی بڕی بووە ئەو شۆخەی خۆشی دەویست، فرمێسک لە چاوەکانی قەتیس مابوو، ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو ووتی: ویستم جوانتر بێ؟!

هەموو بەیەک دەنگ لەقاقای پێکەنینیاندا ووتیان: لووتەکەی جارانەو نەگۆڕاوە، بەڵام پێشتر دەعامی یەی نەبوو ئێستا بۆی کراوە! کچە شۆخەکەش لێی چووە پێشەوەو بە دەنگە نەرمە بەسۆزەکەی ووتی: دڵ لە دڵ مەدە، جوانی بۆ ئافرەتە نەوەک بۆ پیاو.

ئازاری ١٩٨٦

یەکەم نامەی کەدایتێ ئارەقەی سوور و شینت لە هەموو لەشت بەدەردا.. وەکو خوا لەدڵی ئابێت بێنەوەی بزانیت چی تیا نووسیوە و مەبەستی چی‌یە هەستت بە شتێک کرد. نەدەبوو وەری نەگریت.. چی پێ بڵێی؟! زۆر زیرەکانە نامەکەی دایتێ و ووتی: (ئەم پرسیارانەم لەبارەی یاسای ڕۆمانی و مێژووی کۆنی عێراقەوە بۆ نووسیویت. کە چوویتەماڵەوە لەسەر خۆ بیخوێنەوە و وەڵامم بدەوە).

ویستت شتێک بڵێی ماوەی نەدایت وەکو مار بۆی خزی و لەوناوە نەما.

سەرەتای گیروگرفتت لێرەدا دەستی پێکرد. هەر وات دەزانی تهێنی‌یەکی یەکجار گەورەت لەناو دەستت دایە، هەر چەندی دەتکرد جورئەتی کردنەوەییت نەدەکرد.

بەحاڵە حاڵ ئەو ڕۆژەت لێ ئاوابوو. دوای سەرە دیقەیەکی زۆر لە خەوتنی دایک و باوکت دڵنیا بوویت. بەهێمنی نامەکەت دەرهێناو خستتە ژێر میکرۆسکۆپی چاوەکانت.. دڵت سەدو بیست لێی دەدا.. لەگەڵ خوێندنەوەی یەکەم دێری تاسەیەکی ساردت بەلەشدا هات و قسەی دەستە خوشکەکانت هاتەوە بەرگوێ کە دەیانووت (ئەگەر ئەو پیاوە تۆی خۆش ئەوێ بۆ لە هەمووومان زیاتر بایەخ بەتۆ دەدات و چاوی کامیراکەی لە هەموو بۆنەیەکدا لەتۆ دەگات)

دیسان تەکانێکت دەدایەوە بەرخۆت و لە خوێندنەوەی بەردەوام دەبوویت. هۆیێکت بۆ کرد و لەبەر خۆتەوە دەتووت (منیش لە تۆ زیاتر تۆم خۆش دەوێ ئەگینا ئەو هەموو دیاری و خەڵاتانەم لێت وەرنەدەگرت. بەڵام چۆن دەبێ بەشداری خۆشەویستی کەسێکی‌تر لەژیانتا بکەم کە پێش من جێگای لەناو دڵی تۆدا کردبێتەوە..) دڵۆپ دڵۆپ فرمێسک لەچاوە جوانەکانت دەتکایە خوارەوەو بەسەر ڕوومەتی تەنکتدا بڵاو دەبۆوە.

هەموو گۆشەیەکی ژوورەکە لێت ببووە دەم و گوێیان پڕ کردیت (جوانێکی وەکو تۆ و پیاوێکی بەژن و ماڵیان ئەوتووە.. بە خەڵک دەڵێی چی؟)

وەختابوو مێشکت بتەقێ.. مێشکت ببووە چەند بەشێک هەر یەکەی بڕیاری لەسەر شتێک دەدا..

بەشێک دەیووت (ئەو پیاوە زۆر تۆی خۆش دەوێ، دوای گەورەترین تاقی‌کردنەوە دیلی خۆشەویستی تۆ بووە و خۆی پێ ئازاد ناکرێ.. بیکەو دڵ لە دڵ مەدە) بەشێکی

تریش دەیووت (ئەکەی بەقسە بکەی.. چی بە خەڵک دەڵێی؟!) بەشەکەی تریش لەو ناوەدا واقی وورما بوو، تەیدەزانی بە قسەی کامەیان بکا.. گوێ بۆ قسەی خەڵک ڕابخات و بە ئەنجامەکەی ڕازی بێت، وەیان خۆشەویستی‌یەکی پاکی بێتاوان لە سێدارە بدات.

لەگەڵ لێدانی زەنگی سەعاتەکە ڕاچڵەکیت... پێنووسەکەت گرتە دەست و لەژێرەوەی نامەکە بە خەتێکی گەورە نووسیت بەداخەوە... ویستت تەواوی بکەیت، دوو دڵۆپ فرمێسکی زیوی لە چاوەکانت باڵەفڕەیان گرت و لەنێوان نووکی پێنووسەکەت و دوا ووشەکە نیشتنەوە و هێلانەیان لێی دروست کرد.

لافیتـەیەکی گەورە، بە خەتێکی گەورە لێی نووسرابوو بە خێرهاتنی بەڕێز وەزیری دەوڵەت ( ؟ ) نوێنەری بەڕێز سەرۆک کۆمار بۆ ناوچەکەمان دەکەین. هەڵوێستەیەکم بۆ کرد. بەهەڵم زانی خۆم بگەیێنمە لای جەنابی وەزیر بۆ مەسەلەی گواستنەوەی فەرمانی برا ئەندازیارەکەم. ماوەیەک بوو ناوی لە دەزگایەکی میری لەپاشووری وولات دەرچوو بوو. لەبەر کەم دەرامەتی و باری ژیان نەیتوانی پەیوەندیی پێوەبکات. هەر لەو رۆژەوە بەردەوام بە دوو قۆڵی بە دوای واسیدەیەک دەگەڕاین بۆ گواستنەوەی فەرمانەکەی لەوێ بۆ شارە دێرینەکەی خۆمان. بێ سوود بوو. دامەزراندن و گواستنەوەی ئەم جۆرە فەرمانانە تایبەت بوون بە جێگری سەرەک وەزیران.

پێکەوتم کە وەزیری میوان، نوێنەری سەرۆک کۆمار لە هاوینەهەواری لای خۆمان بۆ ماوەی دوو حەفتە دابەزیوە. ئێوارەیەک چوومە تەشریفی. لەدەرگای حەوشە چوومە ژوورەوە، کەس پێی نەوتم ناوت چی‌یە. زۆر چاوم گێرا کەسی وام نەدیت سەروشێوەی لەپاسەوان و حاشی‌یەی وەزیر بکات لەبیری خۆم ووتم: وەزیر لەهەر شوێنێک دابەزێ، لە کیلۆمەترێک دوورەوە خێوەتی پاسەوانی بۆ هەڵدەدرێت و هەر لە دوورەوە مەردم دەنگ دەدەن و لەسەری‌یەوە هەتاکو بنی پێی دەپشکنن، وەکو پەمۆ لە پەڕەی دەدەن ئەوسا رێگای پێ دەدەن بەرەو ماڵی وەزیر گوزەر بکا، وەزیریش ئەوا هەر بەناوەکەی دیارە، پیاوێکی رێک و پێک و پۆشتە، چاکەت و پانتۆڵێکی ئاخر مۆدیل و بۆین باخی گران بەهای لەبەردا، بۆنی گوڵاوو قوڵانیاشی رۆژە رێیەک دەڕوا. لەمەجلیسی‌یدا دەستەیەک پیاو ماقوڵان دادەنیشن و دەستەیەک رەش و رووتیش دوور بەدووری بەپێوەو بێ راوەستان لە خزمەتی میوانان دان.

ویستم بگەڕێمەوە دەرەوە، یەکێک بانگی کردم ووتی: فەرموو بزانم کێیت

دەوێ؟ ئاورم دایەوە بیبینم، رەشماڵێکی گەورە لەناوەراستی باخچەکەدا هەڵدرابوو. سێ پیاوو ئافرەتێکی شۆخی لەژێر دانیشتبوو. هەر سێ پیاوەکە لە سوچێکی یەوە بە چوار چمکی لێی دانیشتبوون، تەختەی دامەیان لەئامێز گرتبوو، خەریکی دامەکردن بوون. لەسووچەکەی تریشەوە ئافرەتێکی شۆخ بەجلی کوردیی یەوە لەپشت سەماوەرێکەوە دانیشتبوو، ناوە ناوە دەستە چایەکی بۆ تێ دەکردن.

لێیان نزیک کەوتمەوە. دوای سڵاوکردن، ووتی یان فەرموو کێت دەوێ؟ ووتم: ئەگەر بەهەڵە نەچووبم، جەنابی وەزیرم دەوێ، هەندێک ئیشم پێی هەیە.

یەکێکیان بەدەست ئیشارەتی بۆ ئەوەی بەرامبەری کرد ووتی:

ئەوە جەنابی وەزیرە. فەرموو دانیشە.

چاوم ئەبڵەق بوو، واقم وورما، کەلێی وورد بوومەوەو تێم ووروانی خۆم پێکەنینم بە خۆم دەهاتەوە، نەدەچووە ئەقڵم. کورتەک و شەرواڵێکی مرادخانی لەبەردابوو، کڵاوو جەمەدانیش لەسەر. کۆمەڵێک بەردی قاوەیی ی لەناو لەپی دەستی چۆیەی دابوو، بەدەستەکەی تریشی بەردی رادەماڵی و دەیووت: بخۆ.. برۆ... باژۆ... بخۆ... برۆ... ئەمەش دامە.

هەتا دەمێک کەس خۆی تێم نەگەیاند، خەریکی ریزکردنی دامەو هەڵگرتنی بەردی یەکتر بوون. دوایی جەنابی وەزیر ئاورێکی لێ دەدامەوەو دەیووت:

خێربوو هاتبووی؟

منیش بەقوونە تۆتکێ لێی نزیک دەکەوتمەوەو ووردو درشت مەسەلەکەم بۆ دەگێرایەوە. هەستم بەوە کردوو هەر لەسەرەتاوە ئاگای لێم نەدەما، بەحەماسەوە خەریکی بردنە پێشەوەی بەردەکانی بوو. لەناکاو پڕ بەدەنگ هاواری دەکرد، دامەو سواریشم! بەردەکانت لابە نەگینا تۆیان دەبڕێنمەوە!!

چەند جارێکی تر، هەمان پرسیاری لێ دووبارە و سێ بارە کردمەوە منیش وەکو جاران ئاسایی، لێی دەچوومەوە پێش و بەنەرمی یەوە دەمووت: جەناب براکەم... هێشتان تەواوم نەدەکرد، ئەو دامەیەکی تری نزیک دەکردو حەماسەت دەیگرت، پڕ بەدەنگ هاواری دەکردەوە دامەو بەردەکانت لادە!

هەتا ئەو دەستە دامەیە تەواو بوو، تووشی ئیستقابووم، زیاتر لە دە جاران جەنابی وەزیر بە دەم یاریکردنەوە دەیووت:
ئێ ی ووتت بۆ چی هاتبووی؟
منیش دەمزانی لەبەر یاری ی دامەکە، فری بەسەر جمهوری یەتەوە نی یە، بۆ موجامەلە وادەڵێ. بۆیە یەکسەر دەمووت: جەناب براکەم، هەر ئەوەندەو بەس!
ئەویش هەتا دەمێکی تر رووی تێ نەدەکردمەوە.
ئێوارە درەنگ داهات. ئەوەندە دانیشتبووم، قاچەکانم لەژێرمدا سڕبوون. لەبەر عەیبە ئەبا هەر زوو هەڵدەستام و جەنابی وەزیرم بەجێ دەهێشت. سواربوونی کەر عەیبێکە و هاتنە خوارەوەشی دوو عەیبە! منیش بۆ ئیشی براکەم هاتبووم، نەدەبوو بەبێ ئەنجام بگەڕێمەوە.
خوا رەحمی کرد، پیاوەکەی بەرامبەری هەندێک دەستی خۆی شل کردو خۆی بەدۆڕاندندا، تۆ مەڵێ جەنابی وەزیریش هەر ئەوەی مەبەست بوو، بۆیە هەر لەگەڵ بردنەوەیدا گشت بەردەکانی خستەلاوەو لەقاقای پێکەنینی‌دا ووتی:
ئەم جارەش لێم بردی‌یەوە!! خواردنی عەلیشیشەکەم حەلاڵ کرد.
ئەوجا رووی تێ کردم و بەپێکەنینەوە ووتی: ووتت هاتبوویە لای کێ؟!
بەزەردەخەنەیەکەوە ووتم: لای جەنابت.
ووتی: دەزانی من کێم؟ ووتم: تۆ جەنابی وەزیری دەوڵەت و نوێنەری سەرۆک کۆماریت.
ووتی: بەڵێ، چ کارێکت هەیە؟
مەسەلەی براکەم بۆی گێرایەوەو داوام لێ ی کرد، کە جەنابی بەو سیفەتەی وەزیرەو نوێنەری سەرۆک کۆمارە داوا لە جێگری سەرۆک وەزیران یان سەرۆک کۆمار بکات بۆ گواستنەوەی فەرمانی براکەم.
لەقاقای پێکەنینی‌دا ووتی دیارە تۆ خراپ تێگەیشتووی؟!
ووتم: بۆ جەناب؟
ووتی: وادەزانی کە من وەزیرم، وا بە ئاسانی چاوم بە جێگری سەرۆک وەزیران یان سەرۆک کۆمار دەکەوێ؟ بەسەرسوڕمانەوە ووتم: ئەی چۆن جەناب.

بۆ ئێوە زوو زوو یەکتر نابینین؟!

بەدەم پێکەنینەوە، هەتا هێزی لەبەردابوو، جرتێکی درێژی کێشاو بەدەنگێکی گەورە وەتی: ترحیتوا! تۆ کە هاوولاتیت ڕەنگ بێ نەترسیت و بتوانی بەئاسانی خۆت بگەیەنیتە لای هەردووکیان بەڵام من جەژن و جەژن یان لەبۆنەکاندا نەبێت نایان بینم. ئەگەر باوەڕیش ناکەیت، وەرە لام لە پایتەخت.

چوار وەزیرین لەیەک ڕیز. ئیشارەتی بۆ ئەو دوو پیاوەی لەگەڵی دانیشتبوون کردو وتی: ئەم دوو پیاوەش دەبینی؟ یەکی‌یان سکرتێرمە لەوەزارەت ئەوەی تریشیان شۆفێرەکەمە.

بوومە لێپرسراوی بەکرێدان و سەرپەرشتی خانووی هاوینەهەوارەکان.. خانوێکم کردە مەڵبەندی بەڕێوەبردنی کاروباری سەرپەرشتی و بەکرێدانی خاووەکانیتر.

ژوورێکم کردە نووسینگەی کارگێڕیی و دوو ژوورەکەی تریش بۆ خەوتن و حەسانەوەی خۆم.

ئەحمەد ناوێک لەجێیەکی دوورەوە بۆ ئیشکردن هاتە هاوینەهەوارەکان و بە مووچەیەکی کەم لە نووسینگەکەی ئێمە دامەزرا.

کوڕێکی ئێسک سووک و قسەخۆش و خوێن شیرین بوو... دایک و باوکی نەمابوو. لەدوای خوا لە ئێمە زیاتر کەسی تری شک نەدەبرد یارمەتی بدەن. بۆیە لەلای خۆمەوە بڕیارمدا کە کلیلی ژووری کارگێڕی بدەمێ، دوای تەواو بوونی کاتی ئیشکردن بۆ خۆی هەر لەوێ لەسەر لاقەنەفەیەک بخەوێ.

ڕۆژهات و ڕۆیشت. ئەو کوڕە قۆزە بەڕۆژ خەریکی خاوێن کردنەوەی ژووری کارگێڕی و بەڕێکردنی هاوینە خۆرەکان بوو و بە شەویش لەجیاتی ئوتێل بۆ خۆی هەر لەوێ لێدەخەوت. لەبەر پڕئیشی و زۆریی هاوینە خۆران سەرمان زۆر قاڵ بوو. تەنانەت نەم دەتوانی پشتی خۆم بخورێنم. هەر لە هەشتی بەیانییەوە هەتا هەشتی شەو خەریکی دابینکردنی خانوو بووین بۆ هاوینەخۆران. ئیش و کاری سێ فەرمانبەرم ڕادەپەڕاند سەرپەرشتیی خانووەکان و بەکرێدانیان و بڕینی وەسڵی پارەم پێ سپێردرابوو. هەرچەندە بەپێی تەعلیماتی وەزارەتی دارایی دەبووایە ڕۆژێ بەڕۆژێ ئەو پارەو پوولەی لەلام کۆدەبێتەوە لیستەیەکی پێ ڕێک بخەم و بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ سەرەتای دەوام بیدەمە بانق. بەڵام هەروەکو ووتم لەبەر سەرقاڵیم ماوەی ئەوەم نەبوو وا بەووردی بەپێی تەعلیمات بجووڵێمەوە. بۆیە نەک ڕۆژی جارێک تەنانەت جاری واهەبوو خۆی لە نزیکی مانگێکەوە دەدا، نەم دەتوانی ڕوو لە بانق بکەم و ئەو پارەو پوولەی لەلام کۆبۆتەوە بەوانی بسپێرم.

ڕۆژێک تازە سەرەتای دەست پێکردنی ئیش و کارم بوو. چوومە پشت مێزەکەم

دانیشتم. مێزەکەم بریتی بوو لە مێزێکی ئاسنی چوار چاومێز. سێ چاومێز لەلایەک و یەکی گەورەش لەناوەڕاستەوە. سویچەکەم لە باخەڵم دەرهێناو چاومێزی ناوەڕاستم کردەوە. ئەو ڕۆژەیان سەرم چۆڵ بوو بۆیە بەهەڵم زانی کە خۆم خەریکی ڕێک خستنی لیستەی پارەو وەسڵەکان بکەم و ئەو پارەو پوولەی لەلام کۆبۆتەوە بینێرمە بانق.

لیستەکەم ڕێک خست و کەوتمە ژماردنی پارەکان و بەراوردم کرد لەگەڵ نرخی ناو لیستەکە. بینیم شەش سەد دیناری ناتەواوە. چەند جارێک بەراوردم کردەوە هەمان ئەنجام دەرچوو. ڕەنگێکم هێناو ڕەنگێکم برد لەخەمان ئارەقەی سوور و شینم پەدەردا. هەرچەندی بیرم کردەوە نەمزانی ئەم ناتەواوی‌یە لەچی پەیدابوو. گومانم لەدەست پاکی‌ی خۆم نەبوو. دڵنیابووم لەوەی کە فلسێکی سوورم نەچۆتە قوڕگەوە، بەلام چی دەڵێ‌ی، پارەیەو ناتەواوە ناتەواویش مانای دزی دەدا بەدەستەوە، دزیش لێپرسینەوەی بەدوواوەیەو بەندیخانەو ڕیسوابوونی‌ی سزایە. بەدەستی خۆم ئەو پارانەم خستبووە ناو چاومێزی ناوەڕاستی مێزەکەو بە سویچ جوان گلیلم دابوو. لەمنیش زیاتر سویچەکەی لەلای کەس نی‌یە ئەی کەواتە کێ ئەوپارەیەی بردووە؟!

زۆر لەمێزەکە وورد بوومەوە، هیچ شوێنەواری شکان و دەسکارییم پێ‌یەوە بەدی نەکرد. هەرچەندی کردم تەم دەزانی چۆن ئەم نهێنی‌یە لەلای بەڕێوەبەری دایەرەکەمان بدرکێنم و داوای یارمەتی لێ‌بکەم.

مووچەکەم هەشتا دینار بوو، ئەگەر هەشت مانگی ڕێک بەس بە هەوا بژی بوومایە ئەوسا دەمتوانی کەلێنی ئەو پارەیە پڕبکەمەوە. ئەمەش مەحاڵە!

خەمی لیژنەی پشکنین و پیاچوونەوەی داراییش لەلایەکی تر بێنێتەوە خۆ هەرکاتێک ئەو لیژنەیە سەرێکی لێ پەیدا دەبوو، ڕۆح لە جێ‌گایەکی قایم بوو دەرنەدەهات دەنا لە تاوان دەمردم. دوو هەفتە ئەم نهێنی‌یە گەورەیەم لەناو مێشکی خۆم حەشاردا. زۆر جاران لەبیری خۆم دەمووت (تۆ بڵێ‌ی ئەحمەدی کرێکار ئەو پارەیەی نەبردبێت؟) دووایی هەر بەخۆم مشاوەرەی خۆم دەکرد و ئەو خەیاڵەم لەبیری خۆم فڕێ دەداو دەمووت (چۆن دەبێ ئەو باوەڕە گەورەیەی داومەتە ئەحمەد ئێستاش وا بە ئاسانی لێ‌ی بستێنمەوە).

زۆر دوودڵ بووم لەسەر تاوانبارکردن و نەکردنی ئەحمەدی کرێکار. وەکو یاری‌ی

شێرو خەتێ هەموو دەم لەبیری خۆم دەموت (هەوە...: هەونی‌یە... دزە... دز نی‌یە... بردوویەتی ... نەی بردووە).

دەمویست هەرزوو پێی بڵێم و بیرێتەوە، بەڵام لەوە دەترسام کە هەستی زامدار بکەم و دزیش نەبێت. ئەوکاتە چۆن هەستی زامداری گەنجێکی وەکو ئەوم پێ سارێژ دەبوو؟! لەگەڵ یەسەر چوونی هەر رۆژێک زیاتر ترس لە دڵم دەنیشێت و لەبیری خۆم دەموت (ئەگەر لیژنەی پشکنین بێن و ئەم ناتەواوی یەم لەلا شک بیەن، پێستەم دەبەنە دەباغ خانەو ماڵم وێران دەکەن. دەم خەنە بەندیخانەوەو ریسوام دەکەن. ئەوجا با هەر هیچ شتێکم بەخۆم شک نەیەت، دەمی دونیام لێ دەبێتەوەو لە هەموو لایەک دۆڵم بۆ دەکوترێ. رۆژێک چەکمەجەی ناوەراستم کردەوە، ویستم تەماشای لیستەی خانووە بەتاڵەکان بکەم. بینیم نامەیەکم بۆ لە هاورێیەکی دوورە شارەوە بۆ هاتووە و لەسەرەوەی پارەو پوولەکانی ناو چەکمەجەکە داندراوە.

کە چاوم پێی کەوت، چاوەکانم ئەبڵەق بوون. حەپەسام، سەری گوریسم کەوتە دەست، مەسەلەی پارەم هاتەوە یاد. لەبیری خۆم ووتم (ئەو دەستەی ئەم نامەیەی لەناو ئەو چەکمەجەیە دانابێت هەر ئەویش شەش سەد دینارەکەی بردووە). پارەی حەڵاڵ ناروات. بێ لەدەستی من واپێ دەچێت دەستێکی تریش هەبێت لەناو مەجەرەی ئەم مێزەدا بێت و بچێت. کەوتمە بیرکردنەوە، لەکوێوە دەست پێ بکەم، چی بە ئەحمەد بڵێم. لەبیری خۆم دەموت (من هەموو بروایەکم داوەتە ئەو کورە، ئێستاش چۆن دەبێ وا بە ئاسانی ئەم بروایەی لێ بستێنمەوە). بانگم کردو پێم ووت:

– نازانی ئەم نامەیە کێ خستوویەتی‌یە ناو ئەم مەجەرەیەوە؟

بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی:

– لەگەڵ پۆستەی دوێنێ بۆت هاتبوو. لەیادم چوو دوێنێ پێت بڵێم بۆیە خستمە ناو چاومێزەکەوە هەتا خۆت بیبینیت و دەری بهێنی. کە ئەمەی ووت لەجێی خۆم ساردبوومەوە. کەوتمە دوو دڵی من چاوەرێی ئەم قسەیەم لێی نەدەکرد. لەبیری خۆم ووتم: (ئەگەر ئەو پارەکەی بدیزی‌بووایە چۆن ئێستاکە دانی بەوەدا دەنا کە هەر ئەویش ئەم نامەیەی بۆم خستۆتە ناو چاومێزەکەوە؟) زۆر مشاوەرەی مێشکی خۆمم کرد بێ سوود بوو. نەچووە ئەقڵمەوە یەکێک بەم شێوەیە پارە بدزێت و نهێنی‌ی

گردارەکەش بدات بەدەست خاوەنەکەیەوە. ئەی باشە کێ ئەم پارەیەی دزیوە؟ هەڵبەتە لە دووکەس دەرنەچووە. یان خۆم وەیان ئەحمەدی کرێکار. ماقوول نی یە شەش سەد دینار لەو ئاوەدا بەبێ هۆ تیا بچێت. ئاویش نی یە بوویێتە هەڵم. خۆ جنۆکەش نەی بردووە! کەسەیری دەم و چاوی ئەحمەدم کرد، پاکی و بێگەردی و دڵسۆزیم لێ ی بەدی دەکرد. بۆیە هەرچەندی دەم کرد نەم دەتوانی هەستی زامدار بکەم و بەدزی دەربهێنم.

بەدز دەرهێنان زۆر ئاسانە. سەرچاوەکەی نووسینی ڕاپۆرتێکە. ئەفسەری پۆلیسیش دەپرسێ بۆ گومانت لەو کوڕەیە؟ منش دەڵێم لەبەرئەوەی تەنیا من و ئەو لەو پرسگەیە کاردەکەین، دوای دەوامیش ئەو بەتەنیا لەژووری کارگێڕی ی دەخەوێ، ئەویش دەڵێ، ئەوە مەرج نی یە بۆ تاوانبارکردنی یەکێک کە ئەی کردبێت. منیش دەڵێم دوای وون بوونی پارەکە بەچەند ڕۆژێک، ئەم نامەیەی خستبووە ناو هەمان مەجەڕە، کە کلیل دراوەو کلیلەکەشی تەتیا لای خۆمە. ئەوکاتە قەناعەت بەقسەکانم دێنێت و ڕوو لە ئحمەد دەکات و دەڵێ، وابوو؟

خۆ بوختانی پێ ناکەم، ئەوە قسەی خۆیەتی هی من نی یە. هەڵبەتە حاشای لێ ناکات دەڵێ وایە.

ئەوکاتە کەلەپچەی لە دەست دەخەن و بەرەو بەندیخانە بەڕێ ی دەکەن.

نازانم ئێوەش دەڵێن چی؟! وا بە خۆتان بینیستان چۆن ئەحمەد بەزاری خۆی دانی پیانا کە بەدەستەکانی خۆی نامەکەی خستۆتە ناو مەجەڕەکەوە. من هەتا ئێستاکەشی لەگەڵدا بێت پێم نەووتووە دزی، پێشی ناڵێم چونکە بڕوام پێ ی داوە دوای دەوام لەوێ بخەوێت. چۆن بۆ شەش سەد دینار ئەم بڕوایە پیرۆزە لێ دەستێنمەوە!!

ناچێتە ئەقڵمەوە ئەحمەد دزبێت، ئێوەش دەڵێن چی؟!

ماقوول نی یە وا بەئاسانی واز لە توێژینەوەی وون بوونی ئەم پارەیە بهێنم. ئەگەر ئەو پارەیە لە گیرفانی خۆم وێر ئەکەم جێگام بەندیخانە دەبێت. ئەگەر خەبەری پۆلیسیش لە ئەحمەد بدەم ئەو لەجیاتی من تاوانبار دەکرێت و دەکەوێتە بەر سێ و جیمی پۆلیسەوە.

دەبێ لایەکیان هەڵبژێرم. بانگی ئەحمەدم کردو ووتم:

– سـویچی ئەو مـەجـەڕەیە تەنیـا لەلای من هەیە، پێم نالێی چۆن توانیت، ئەم نامەیەم بۆ لەناوی دابنێی بەبێ ئەوەی بیکەیتەوە؟!

بەزەردە خەنەیەکەوە ووتی:

– لەژێرەوەی مێزەکە لە نێوانی مەجەڕەکەو مێزەکەت بۆشایی‌یەک هەیە، لەو بۆشایی‌یەدا دەستم ڕەوانەی ناو مەجەڕەکە کرد و نامەکەم بۆت لەوێ دانا.

ئەو جارەیان زیاتر شەیتان وەس واسەی خستە ناو دڵمەوە گومانەکەم لەجاران بەهێزتر بوو، لەبیری خۆم ووتم (لە ئەحمەد بترازێ کەسی‌تر پارەکەی نەبردووە!)

گومانم لە ئەحمەد پەیداکرد. شەیتانیش خۆی خستە ناو مێشکمەوەو پێی دەووتم (تەلەفۆنەکە هەڵبگرە، خەبەری پۆلیسی لێ بدە، بابیبەن. خۆیەتی، ئەو دزیویەتی. من وا نالێم ئەو خۆی وا دەڵێ).

یەک دوو جاران دەستم بۆ تەلەفۆنەکە درێژکرد، دووایی شەیتانم بەتەعلەت کرد و وازم لێ‌هێنا.

ئەحمەدیش نەیدەزانی مەسەلە چی‌یە لەسەر کورسی‌یەکەی بەردەمم دانیشتبوو و بەپێکەنینەوە دەیووت:

– بۆ نامەکەت ناکەیتەوە، بزانیت چی تیا نووسراوە؟

ئاش لە چ حاڵ و ئاشەوان لە چ حاڵێک!! من بەدەردی خۆم کەوتوومە و ئەویش لە ناواخنی نامەکە دەپرسێ. وەی ئەگەر دەزانێت لە ناواخنی نامەکە زیاتر خەریکی شی کردنەوەی ناواخنی ئەوم ئێستا وا پێ‌نەدەکەنی.

دڵم نەهات زەردەخەنەی سەر لێوانی بتۆرێنم، هەستی ناسکی زامدار بکەم بەتاوانبارکردنی بۆیە بڕیارمدا تۆزێک بە دیپلۆماسی‌یانە لەگەڵی بجوولێمەوە. پێم ووت:

– حەزدەکەم ئەم نامەیەم لێ وەربگریت و لەبەر چاوی من بیخەیتە ناو مەجەڕەکەوە، تا بزانم چۆن وا زیرەکانە توانیت بەبێ کردنەوەی مەجەڕەکە وا بەئاسانی ئەم نامەیە بخەیتە دیوی ژوورەوەی؟

هاتە پێشەوەو لە مێزەکە نزیک کەوتەوە. نامەکەی لەدەست وەرگرتم و دەستی خستە ژێرەوەی مێزەکەو بە پێکەنینەوە ووتی:

– دەبینی چۆن لەم بۆشایی‌یە دەستم دەخەمە ژوورەوە؟

سەرم خستە ژێرەوەی مێزەکە تاکو دەستی ببینم، بزانم چۆن دەیخاتە ناو مەجەڕەکەوە.

لەژێر مێزەکەم زەمبیلێکی کاغەزی پیسی لێبوو، بینیم پڕاوپڕی پارە و کلینێکسی پیس بوو. کە چاوم بە پارەکان کەوت لە خۆشییان شاگەشکە بووم. دەستم بۆ سەبەتەکە درێژکرد و دەرم هێنا. دەستم کرد بە ژماردنی پارەکان. قەت بلێی بۆ دەرمانیش فلسێکی ناتەواو نەبوو.

ئەحمەدیش دەتووت لەگوێی گادا نووستووە، دەستی لەژێرەوەی مێزەکە چەقی بوو و چاوەکانی بڕی بوونە من و دەی ووت:

– ئێستا زانیت چۆن نامەکەم خستە ناو چاومێزەکەوە؟!

لەقاقای پێکەنینم داو ووتم:

– بەڵێ لە ژێرەوەی مێزەکەدا.

بەلای پارێزگا تێپەڕ دەبووم، پیاوێکی قەڵەو، ڕانک و چۆخەی کر لەبەر، دەباتچەیەکی نیکڵ و خەنجەرێکی دەبان لەبەر پشتی، بانگی کردم. ئاوڕم لێ دایەوە، لە پێش دەرگای پارتێکی سیاسی ڕاوەستابوو. شەش حەوت چەکداریش بە دوایەوە. هەڵوێستەیەکم کرد و لێی وورد بوومەوە، لە ناسینی گومانم پەیدا کرد. بەمەندە نەوەستا، بەرەو لام هات و باوەشی پیا کردم، هەردوو لا ڕوومەتی ماچ کردم و لە هەواڵی پرسیم. ووتی: نامناسی‌یەوە؟

ووتم: زۆر شێوەت لە عوسمان دەکات، ناکات هەوبێت؟! لەقاقای پێکەنینی‌دا، ووتی: بەڵێ هەوم، دیارە نەت دەناسییمەوە؟! بەسەرسامی‌یەوە ووتم: بێ قەزابی، چۆن بتناسمەوە. تۆو ئەم چەک و جبەخانەیان نەووتووە. ئەی تۆ لەوەتی دەتناسم هەر خەریکی نواندن و پیشەی نانەوایی نەبووی؟!

ووتی: نواندن و نانەوایەتی لەسەرم تاپۆ نەکراوە! بەخوت دەزانی گرانی‌یە و گوزەران بەزەحمەت کەوتووە. ئێستاش وەکو جاران نان فرۆشتن رەواجی نەماوە، نواندنیش بەهرەیە هیچ نان نادات. لەم دوایی‌یەدا بیرم لەوەکردەوە خۆم بەشتێکی ترەوە خەریک بکەم، جێی ئەم دووشتە بگرێتەوە و ڕەواجیشی باشتربێت.

سەرم سوڕما، یەکەم جارە قسەی وام گوێ لێ بێت. ووتم: چۆن ئەم کارەی تۆ نانیش دەدات؟!

دەستی گرتم و بەرەو ژوورەوەی بارەگایی پارتەکەی کشاندمی. چەند ژوورێکی پێ‌کردم. بەدەم ڕۆیشتنەوە، نیشارەتی بۆ ژوورەکان دەکرد و دەیووت: ئەمە ژووری لێپرسراوی لقە، ئەمەی تریان ژووری لێپرسراوی ناوچەیە ئەو ژوورەی تەنیشت ئەویش ژووری کادیری پێشکەوتووە، ئەوەی تریشیان ژووری پاڵێوراوانی پارتەکەمانە. چەند ژوورێکی تریشی نیشاندام و هەریەکی ناوێکی بۆ دانابوو هەتا گەیشتینە ژوورێکی گەورە، لەپێشەوەی‌دا کورسی ومێزی

سکرتێرێکی لێ داندرابوو. ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو، بەتاڵی ی زۆربەی ژوورەکان بوو. هەروەکو لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا جۆرە زانیاری یەکم لەبارەی پارت و ڕێکخراوە سیاسی یەکان پەیدا کردبوو، سەیرم بە دیمەنی ئەم پارتە دەهات. دانم بەخۆم داگرت، بۆ هەلێک لێی گەڕام تیایدا کۆمەڵێک پرسیار و سەرنج بخەمە ڕووی هاوڕێکەم.

چووینە ژوورێکی تر، دیوارەکان بەنەقش و نیگار ڕازابوونەوە، گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ بە بنمیچی ژوورەکە شۆڕ ببوونەوە، چوار تەلەفۆنیش لەگەڵ سێتێک قەلەمی گرانبەها و کاتژمێرێکی سەرمێز، سەرمێزەکەیان ڕازاندبۆوە. لەپشتەوەی مێزەکە وێنەیەکی گەورەی هاوڕێکەم لەناو چوار چێوەیەکی ساج بەدیوارەکەدا هەڵواسرابوو. لەژێرەوەی وێنەکە نووسرابوو، وێنەی بەڕێز ڕازگری گشتی ی پارت. سەیرێکی نووسینی ژێرەوەی وێنەکەم کردوو لە وێنەی هاوڕێکەم وورد بوومەوە، مانگێک لەوەو بەرم هاتەوە یاد. بەیانی زوو بوو بۆ لای عوسمان هاوڕێم هاتم، لام دایە لای و لەکاری هونەریێم پرسی لەبەر مەشغوڵی خۆی و وەلام داتەوەی منیش ئاگای لە نانی ناو تەنوورەکە بڕا، لە پانزە نان تەنیا یەک نان و نیوی لێ دەرچوو، ئەوانی تر گشتی سووتان.

چووە پشتەوەی مێزەکە دانیشت، منیشی لەسەر کورسی یەکەی بەرامبەر خۆی دانیشاند.

بەسەرسامی یەوە پێم ووت: ماقوڵە وا گەورە بوو بێت و من پێم نەزانی بێت؟!

ووتی: خوا گەورەیە، من هەر عوسمانی جارانم تەنیا بەهرە و پیشەکەم گۆڕاوە.

ووتم: چۆن وادەڵێی، چما سەرۆکایەتی پارتێک گاڵتەیە. پیاوی سیاسی هەموو ژیانی لەڕێی میللەتەکەی بەخت دەکات و چەندین جار دوژمن تەڵەی بۆ دادەنێتەوە، تووشی بەندی و ڕەنجەڕۆیی و ئاوارەیی دەبێت و لەپەتی سێدارە قووتار دەبێت. ئەگەر خوا تەمەنی بدات ئەوسا دەبینێ ڕەنجەکەی بەفیڕۆ نەچووە و بەئاشکرا لەپشتەوەی مێزێکی وادا دادەنیشێت.

بەپێکەنینەوە ووتی: ئەوە چی یە، پێمان ڕادەبوێری؟!

بە خەجاڵەتەوە ووتم: ئەستەغفیروڵا، بە شانازی ییەوە وا دەڵێم، کێ هەیە ئەم

رۆژەی بۆ هاورێی خۆی نەوێت.

ووتی: ئێستا گوزەرانت چۆن دەسوورێ؟

ووتم: زۆر خراپ.

سەری لێم هێنا پێشەوە، ووتی: هەی لەمنت نەکەوێ! چی دەڵێی وابکەم تۆش بکەنە لێپرسراوی ناوچەی پارتەکەمان.

ویستم وەڵامی بدەمەوە. ماوەی نەدام، تێی هەڵکردەوە

ووتی: مانگی چوارسەد دینار باشە؟

پێکەنینم بە قسەکانی هات ووتم: ئەوە چی دەڵێی؟!

هەرچەندە لە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی و پارت کارم نەکردووە بەڵام سەرم لێی دەردەچێ. هەتا یەکێک دەگاتە ئەو پلەیە نیوەی تەمەنی تیای بەسەر دەبات.

بە پێکەنینەوە ووتی: ئەمە قسەی ناو دەفتەرو کتێبە!!

منیش ووتم: فلان کەس لە تەمەنی منەوە لە پارتەکەی کاردەکات، چەند جاریش بەندکراوە و ئێش و ئەشکەنجەی چەشتووە و دەربەدەری شاران و چۆڵ و چیا بووە ئینجا جێگری رازگری گشتیی پارتەکەیەتی!!

ووتی: نان ئەو نانە، ئەمڕۆ لە خوانە، تۆ قسەی من وەربگرەو حەقت بەسەر نووسینی ناو کتێب و نیزامی ناوەوەی پارتەکان نەبێت؟! قسە شتێکە و کردار شتێکی ترە!!

ووتم چۆن؟ ووتی: چۆن لەسایەی برادەرانی دڵسۆز دەوڵەت ئەم پارتەی بۆ دامەزراندوم و مووچەیەکی باشیشی بۆ بڕاندمەوە ئەوهاش تۆ دەکاتە خەباتگێڕو بە فەرمانێکە نیوەی تەمەنت بۆ پاشەکەوت دەکا.

لەقاقای پێکەنینمدا ووتم: بابزانم لێپرسراوی لق و کادیری پێشکەوتوو و پاڵێوراوانی پارتەکەتان کێن و ژمارەی ئەندامانتان هەتا ئێستا گەیشتۆتە چەند؟

لە چاوەی مێزەکەیەوە، دەفتەرێکی دەرهێنا، چاوێکی پێداخشاند ووتی: مەبەستت هەر ئێرەیە یان گشت لقەکانمان لە سەرتاپای ووڵات؟

ووتم: هەر هەموویان.

ووتی: تزیکی پەنجا ئەندامێک دەبێت بێ لە حەوت پلەی بەتاڵ. یەکێیان ئەو فەرمانەیە کە عەرزی جەنابتانم کرد.

هەستامە سەرپێ، خوا حافیزم لێ‌ی کرد. ووتی: چیت ووت، دەتەوێ بتکەینە لێپرسراوی بەشی ناوچە؟

ووتم: نەخێر، ئەم کارە بەمن ئەنجام نادرێ، هەر خەریکی نواندتەکە دەبم.

ووتی: ئەمەش هەر نواندنە، بەڵام پارەشی لەگەڵ دایە.

دەساڵ زیاتر بوو فەرمانبەری ئەو دایەرەیە بووم. تابڵێی بە حەماسەوە بەپیش و کارم هەڵدەستام، هەر جێی ئارەزامەندی بەڕێوەبەر و بەڕێوەبەریی گشتیی بووم. بەحەزرەتی ئەو رۆژە بووم کە سوپاسنامە و خەڵاتم پدرێتێ وەکو هەندێک لە فەرمانبەران. زۆرم بیردەکردەوە، سەرم لە تهێنیی ئەم هەڵسەنگاندنە دەرنەدەچوو. فەرمانبەری وا هەبوو حەفتەی رۆژێک دەوامی نەدەکرد، ئەیدەزانی ناوی خۆی بەتەواوی بنووسێ کەچی مانگی جارێک سوپاسنامەی ئاراستە دەکراو لەبۆنەکاندا خەڵات دەکرا.

لێپرسراوی بەشەکەمان لەوێ ئەبوو، پشووی دوو حەفتەی وەرگرتبوو. لە جیاتی ئەو منیان لە لیژنەی ئامادەکردنی کۆنگرەی ساڵانەی دایەرەکەمان دانا. کۆنگرەکەمان لە هۆڵێکی گەورەی دایەرەکەمان بەست. هەر لە بەڕێوەبەری گشتیی دایەرەکەمان و جەنابی پارێزگارەوە تا دەگاتە وەزیری حوکمی خۆجێیەتی و زۆربەی لێپرسراوو فەرمانبەرانی سەر بە دایەرەکەمان لەو کۆنگرەیە ئامادە بوون.

لەبەرامبەر میوانەکان، لەپشت دوو مێز، جەنابی پارێزگارو بەڕێوەبەری گشتیی و بەڕێوەبەری دایەرەکەمان و لیژنەی ئامادەکردنی کۆنگرەکە دانیشتبوون.

منیش بە تەنیا لە پشتەوەی ئەوان لەپشت مێزێکەوە دانیشتبووم کۆمەڵێک وەرەقەو قەڵەمم لەبەر دەم دا بوو. ئەوەی لەو کۆنگرەیە دەووترا دەم نووسیەوە.

لەناو گەرمەی کۆنگرەکەدا، پارێزگار ئاوڕی لێم دایەوەو بەئیشارەت بانگی کردم. چوومەلای، سەری لێم نزیک کردەوەو بە ئەسپایی پێی ووتم: کە کۆنگرەکەدا تەواو بوو، لەگەڵ سایەقێک بچۆ بازاڕ، فەردەیەک گوێزی باش بکڕە، بەناوی من بۆ جەنابی وەزیر بەدیاری ببە. لەئوتێلی زەیتوونە دابەزیوە؟

یەکەم جارم بوو، ببینم گوێز کڕینیش پەیوەندی بە کۆنگرەی ساڵانەی دایەرەوە هەیە! قەت هاموشۆی لێپرسراوانی گەورەم نەکردبوو بۆیە سەری خۆم لەقاندو بەبێ

ئەوەی داوای پارەکەی لێ بکەم ووتم: فەرمان دەکەی جەناب.

دوای تەواو بوونی کۆنگرەکە بەڕێوەبەری گشتیی بانگی کردم، بردمی بۆلاوەو پێی ووتم: ئەو گوێزەی کە دەیکڕی بەناوی من بۆ جەنابی وەزیر بیبە. بەخۆت دەزانی لەدواییدا دەبێ هەر خۆمان پارەکەی بدەین چونکە ئەمە کۆنگرەی سالانەی ئێمەیە، نەک پارێزگا. سەرم بۆی لەقاندو ووتم بەڵێ فەرمان دەکەی. وویستم بڕۆم، هێشتان نەگەیشتبوومە دەرگای دەرەوە، بەڕێوەبەری خۆشمان بانگی کردم و هەمان قەوانی بۆ لێدامەوەو ووتی: ئەم گوێزەی کە دەیکڕی بە ناوی من بۆ جەنابی وەزیری ببەو پێی بڵێ گوێزی باخچەکەی خۆیانە لە تەوێڵە. ئەو جارەیان خۆم بۆ نەگیرا ووتم: جەناب، نازانم بەقسەی کامەتان بکەم. پارێزگار، بەڕێوەبەری گشتیی یان جەنابت؟ بەپێکەنینەوە ووتی: بەقسەی من بکە، خۆت دەزانی پارێزگار لەوە گەورەتر نابێت، پارێزگاری شارێکە، هەموو ساڵێک ئۆتۆمۆبیلێکی سوپەر وەردەگرێ، لەوە زیاتر چی دەوێ؟ بەڕێوەبەری گشتییش، رەق و تەق دەڵێی عەلەشیشە، خۆت دەزانی کاری ئەم بەڕێوەبەریتی‌یە گشتی‌یە لەسەر شانی من و ئێوەیە، بۆ هەر ئەوان بێن بەشت و ئێمەش لە شوێنی خۆمان بمێنینەوە. ئەگەر بوومە بەڕێوەبەری گشتی ئەوا ساڵێک پێشت دەخەم بۆ بەرزبوونەوەی پلەی فەرمانت.

هەندێک بیرم لێ کردەوە، قسەکانی چووە ئەقڵم و پەسندم کرد. سایەقێکم لەگەڵ خۆم بردە بازاڕ، فەردەیەکی گەورە گوێزی باشمان کڕی و بەرەو ئوتێلی زەیتوونە گەڕاینەوە.

گوێزەکەم لە پشتەوەی ئۆتۆمۆبیلەکە بەجێ هێشت و خۆم چوومە دیدەنی جەنابی وەزیر. دەتووت وەزیر زانیویەتی دیاریم بۆی هێناوە، بەرووی خۆشەوە پێشوازی کردم. لە جیاتی بەرەو ژوورەکەی خۆی بمبات، بۆلای ئۆتۆمۆبیلەکەی بردم، بانگی پۆلیسێکی کرد. سندوقی جامپۆکەی پێی کردەوە ووتی: کوا لە کوێیە؟ واقم وڕما. لەبیری خۆم ووتم هێشتان هیچم پێی نەووتووە، چۆن زانی دیاریم بۆی هێناوە. گوێزەکەم بۆ دەرهێنا، لەگەڵ شوفێرەکەمان بە دووقۆڵی خستمانە ناو سندوقی ئۆتۆمۆبیلەکەی. ویستم بڵێم بەڕێوەبەرەکەمان بۆی ناردووە. پشتی تێ کردم و بەدەم ڕۆیشتنەوە ووتی: پێی بڵێ سوپاس گەیشت. نەمزانی لەگەڵ کامیانی بوو،

پارێزگار یان بەڕێوەبەری گشتیی وەیان بەڕێوەبەرەکەی خۆمان یان لێپرسراوێکی تر من پێی نەزانم! فەردە گوێزەکە زۆری لێ کەم ببۆوە، بەڵام لەپێش جەنابی وەزیر نەم ویست بە شوفێرەکەمان بڵێم چی لێ هات. سواری پێشەوەی ئۆتۆمۆبیلەکە بووم. رووم لە شوفێرەکەمان کرد و پێم ووت: گوێزەکە فەردەیەکی تەواو بوو کە کڕیمان، خۆ جنۆکە نەی برد بۆ وا کەم ببۆوە؟!

لەقاقای پێکەنینی دا، کیسەیەکی گەورەی پڕ لە گوێزی لە پشتەوەی گوشنەکەی دەرهێنا ووتی: بۆ هەر وەزیر ددانی هەیە گـــوێز بخـــوا؟! لەوەتی لەو دایەرەیە دامەزراوم خێری گوێزێکم لێ نەدیتووە، دەبا ئێستا لەسایەی وەزیر ئەو خێرەی لێ ببینم!!

چەند رۆژێک بەسەر چوو، کەس دەستی نەبردەوە باخەڵ پارەی گوێزەکەم بداتەوە. خۆ منیش ئەحـمـەد قەدۆ نیـمـە هەتا گوێم لێی نەبێت. ناچار بووم پەردەی شـەرم لەسـەر ڕووم هەڵگرم. چووـمـە لای بەڕێوەبەرو پێم ووت: وەکـو ئاگـادارن پارەی گوێزەکەم لە باخەڵی خۆم داوە. مووچەکەم کەمە بەڵکو ئەمر بفەرموون بمدەنەوە؟

چاویلکەکەی خستبووە سەر لووتی، خەریکی رەش کردنەوەی کاغەز بوو. وەکو بت و سـەتەم، دەتووت لەگـەڵ ئەویشم نی‌یە، وورتەی لەدەم دەرنەچوو. جـارێکی تر بەدەنگی بەرز لێم دووبارە کـردەوە. ئەوجـارەیان لەژێرەوەی چاویلکەکـەی بەتیلی چاوی سـەیری کـردم و بەمنگە منگەوە ووتی: بڕۆ لای بەڕێوەبەری گشـتیی. ئەی تەیووت بەناوی من بۆ وەزیری ببە؟ کەچی ئێستاش خۆی لە گێلی داوە.

چوونە لای بەڕێوەبەری گـشـتیی هەندێک زەحـمـەتە. سکرتێـرەکـەی دەیویست نەهێلێ بچـمـە لای، گـوایا کـۆبوونەوەی هەیە. خـۆم بۆ نەگـیـرا بەبێی ئەو ملم لەژوورەوە نا. هەرچەندی سکرتێرەکەی بانگی کردم. هیچ ئاوڕم لێی نەداوە. چوومە بەردەمی پێم ووت: جەناب بۆ پارەی گوێزەکە هاتوومە، خۆت دەزانی...

هێشتـان قـسـەم تەواو نەکـردبوو، ئەویش وەکو بەڕێوەبەر ئاسا هەر سـەریشی بەرزنەکـردەوە، ووتی: بڕۆ بۆلای جەنابی پارێزگـار، ئەم ئاین و ئۆینە هی ئەو بوو، با ئێستاش پارەکەی بدات.

لەداخـان وەختـابوو مێشکم شەق ببـات، بەهەمـوویان دەیانویست پارەکەی من

لەشیش بدەن. تەمری خوا ڕەزای حەق، لەشوێنی وا پیاو ناتوانێ قسەی حەقیش بکات، ئەوەکو دڵیان برەنجێ. بەساردی چوومە دەرەوە و هەتا لای جەنابی پارێزگار ڕانەوەستام.

سێ چوار پرسگەم بری هەتا گەیشتمە لای سکرتێرەکەی لەبەر تەلەفۆن هەڵگرتن و دانانەوە ئاگای لەمن نەبوو. دەتووت مەئموری بەدالەیە. لەداخان سەرم ئەستوور بوو، چاوەکانم بڕی بووە دەستی سکرتێرو چاوەڕێی ئەوەم دەکرد کەی بەتاڵ دەبێ تا ئاوڕێکم لێ بداتەوە. بەهەزار فاتیحەو قول وەڵلا هەتا دەستی بەتاڵ بوو. شادەیەکی بەحەقم هێنا، داوای چوونە لای جەنابی پارێزگارم لێ‌ی کرد.

پسوولەیەکی نووسی و بەفەڕاشەکەی ناردی‌یە ژوورەوە. دەستم کرد بە سەرەتاتکێ لەگەڵ ژووری پارێزگار و گوێ بیستی زەنگەکەی بووم هەر جارێک زەنگی لێ دەدا و دەرگاکەی دەکرایەوە، پستێک لەجێ‌ی خۆم ڕادەچەنیم، وام دەزانی بانگم دەکا. هەتاکو دەوامیش تەواو بوو هەر بانگی نەکردم.

لەگەڵ تەواو بوونی دەوام، سکرتێرەکەی فایلەکانی پێچایەوە ناو یەک و ووتی: چاوەڕێی چی دەکەی، وا دەوام تەواو بوو، بەیانی وەرەوە.

ووتم: بەیانیش هەر هەمان تاس و حەمامە، هەتا تەی‌بینم ناچمەوە. لەم قسانە بووین، پارێزگار لە ژوورەکەی هاتە دەرەوە. خۆم گەیاندێ و پێم ووت: دەمناسیتەوە کە بە ئەمری جەنابتان گوێزم بۆ جەنابی وەزیر کرێ؟ سەری خۆی لەقاندو بەدەم ڕۆیشتنەوە ووتی: ئەی چۆن ناتناسمەوە، ئافەرین سەلام لە بەڕێوەبەری گشتی‌ی بکە...

ویستم داوای پارەکەمی لێ‌بکەم، هەر تاچێکی کردە دووان و کۆمەڵێک پاسداریشی بەدواوە بوو وەکو گولە چووە خوارەوەو هەر ئاوڕی لێم نەداوە.

بەساردی گەڕامەوە ماڵێ. لەخەمان هیچ نانم پێ نەخورا، دەست لە ئەژنۆ بۆی دانیشتم و کەوتمە بیرکردنەوە. بەیانی کە چوومەوە دایەرە، لە خەمان سەرم بەسەر مێزەکەی بەردەمم کردبوو، نقومی دەریای خەیاڵ ببووم و ئاگام لەخۆم نەمابوو. لێپرسراوی بەشی خۆیەتی ووتی: دەڵێی تەواو نیت، بۆ پشوو وەرناگری؟

سەرم بەرزکردەوە و ووتم: نەخۆش نیمە، لەخەمی قەردە گوێزەکەی لەمەڕ وەزیر

وەختە مێشکم بتەقێ!

وورد و درشت مەسەلەی کڕینی گوێزەکەم بۆی گێڕایەوە. لەتاقای پێکەنینیدا ووتی: هەی لەمنت نەکەوێ بۆ خەم دەخۆی، ئەوە هەر هیچ نی‌یە، فەردە گوێزەکەت بە چەند کڕیوە بە زیادەوە پارەکەی بخەرە سەر خەرجی مێوانداری و هەڵسووڕاندنی کۆنگرەکە. ووتم: ئەم لیستەیە چ پەیوەندی‌یەکی بە پارەی گوێزەکەوە هەیە؟ ووتی: کە خۆیان لە گێلی دەدەن مانای ئەوەیە خۆیان دەیانەوێ لە لیستەی خەرجی کۆنگرەکە شوێنێک بۆ ئەم پارەیە بکەیتەوە!!

ووتم: چۆن، تیایدا بنووسم فەردەیەک گوێزم کڕیوە بۆ وەزیر؟ پێکەنی ووتی: نابێ باسی گوێز بکەیت! لەجیاتی بەرخێک لە لیستەکە ژمارەی بکە بە دووان، لەجیاتی سندوقێک مێوەجات بنووسە دووان، ئەگەر دەشتەوێ پارەی تاکسی و هاتووچۆو ماندووبوونی ئەم دوو ڕۆژەشت بۆ بێنێتەوە، دەتوانی دەسکاری نرخی هەندێک ووردەواڵەو شتی تریش بکەیت.

پێم ووت: ئەگەر لیستەکەت بۆ بێنم بۆم چاک دەکەیت؟

ووتی: بۆ نا؟

لیستەکەم بۆی هێناو خستمە بەردەمی. وورد و درشت دەستی بەگشت ناوەڕۆکی لیستەی خەرجی‌یەکەدا گێڕا. ئەنجام پارەی زیادەکە زۆر لە نرخی فەردە گوێزەکە زیاتر دەرچوو. پێم ووت: ئەو دەسکاری‌یەی تۆ کردت زۆر لەنرخی گوێزەکەی من زیاتری کرد!!

بە پێکەنینەوە ووتی: ئەی نابێت لەبری جێگاکردنەوەی ئەم پارەیە شتێکی بۆ ئێمەش تیا بێت.

بەم شێوەیە پارەکەی خۆم هاتەوە دەست. هەر چەندە لە هەوەڵەوە زۆر پەشیمان بوومەوە کە ئەو پارەیەم لە باخەڵی خۆم بۆ پارێزگار دەرهێنا و بەو دەردەسەری‌یە هەتا بە هەزار نالەی عەلی بەمایەی خۆم هەستامەوە و بە هەزار فڕوفێڵ و بە یارمەتی لێپرسراوی بەشەکەمان پارەکەم هاتەوە دەست. بەڵام ماندوو بوونم بە فیرۆنەچوو، هەر لەو ڕۆژەوە بوومە جێگای متمانەپێکردنی بەڕێوەبەری خۆمان و بەڕێوەبەری گشتی‌ی و جەنابی پارێزگارا! هەموو ساڵێکیش لە لیژنەی خەرجی و

بەڕێوەبردنی کاروباری کۆنگرەی ساڵانەی دایەرەکەمان دایان دەنام. پێشتر کە بەحەزرەتی سوپاسنامەیەک بووم، ساڵێ جارێک ئاراستەم بکەن، ئێستا لە سوپاسنامە وەڕس بوومەو مانگی جارێک پاداشتێکم دەدەنێ و لە هەموو بۆنەکانیش خەڵاتی باشترین و زیرەک ترین فەرمانبەرم پێ دەبەخشن.

# به تەنەکەیەک
# هەنگوین و ڕاوەکێک
# ماست دەبێتە خاوەنی
# ئوتێلێکی چوار نهۆم !!

گریمان مووچەکەی ئەویش بەقەد مووچەکەی من بێت. هەرچەندە من فەرمانبەرم و ئەو کرێکارە بەڵام من دوو منالم هەیە ئەو شەش منالی هەیە بۆیە دەرماڵەی منالەکانی ی لە من زیاترە.

ئەوەت و دوو دینار ئەگەر هەر هەمووی دەست لێ نەدرێت و پاشەکەوت بکرێت لە ڕۆژی دامەزراندنەوە تاکو ڕۆژی خانەنشین بوون دەکاتە بیست و حەوت هەزار و شەش سەد دیناری ڕێک. بەمەرجێک نان و ئاویش نەخوات بەهەوا بژییت و کرێی خانووشی لێنەدات و نەش زانێ نەخۆشی و خۆشی چییە!! ئەی کەواتە چۆن توانی بیبێتە خاوەنی ئوتێلێکی چوار نهۆمی گەورەی گەشت و گوزەر لە هاوینە هەواردا؟!

هەموو ڕۆژێک کە دەبینی ئەم قسانەی لەبیری خۆیدا دەووت و کۆمەڵێک کاغەزی بەم وورده حیسابانە ڕەش دەکردەوە بێئەوەی بگاتە هیچ ئەنجامێک.

کرێکاری نووسینگەی بەکرێدانی خانووبەرەی گەشت و گوزەر بوو لە هاوینەهەوارەکان.

بە قودرەتی قادری و بەچاو قوچانێک لەهیچەوە بووە خاوەنی باشترین و گەورەترین ئوتێلی ئەم هاوینەهەوارە. سەرەڕای ئەمەش ئۆتۆمۆبیلێکی مارسیدسی نوێ و قەلاب و شۆفەلیشی هەبوو. لەهەمووشی سەیرتر ئەوەبوو هەرچەندە بەتەمەن گەورەبوو و خزمەتیشی لە ڕادەی خانە نشین بوون تێپەڕ ببوو کەچی خۆی خانەنشین نەدەکرد. سەری لەکاری ئەم پیاوە دەرنەدەچوو. بەڕێوەبەری هاوینەهەوار کە خۆی بە کۆنە دەرەبەگ دەخوێندەوە کەچی بەحاڵە حاڵ توانی بووی ئۆتۆمۆبیلێکی لادا بە دووعانەی پاشەکەوت بکڕێت و فیزی پێ لێبدات کەچی ئەو هەر بەفشەو بەچاوقوچانێک توانی بیبێتە خاوەنی ئەم هەموو شتانە!! جا چۆن مەردم واقی ناوڕمێ و چاوەکانی ئەبلەق نابێ؟! زۆری بیر دەکردەوە سەری لەم نهێنییە دەرنەدەچوو. زۆر جاران گومانی لێی پەیدا دەکرد و لەبیری خۆی دەیووت (شەیتان

بە نەعلەت بێت، باوەڕناکەم دزبێت. بۆ دزبێت خۆم ئەم بەستەزمانە لە یاریدەدانی فەرمانبەر زیاتر هیچی تری لەبەر دەست نی‌یە!)

ڕۆژێک ئەم وودە حیسابانەی لەناو مێشکدا چەنجالی‌یان دەدا. کۆمەڵێک کاغەزی لەبەردەم خۆی داناپوو خەریکی کۆکردنەوەی مووچەکەی ئەو بوو، زەرب و دابەشی یەکتری دەکرد کەوتبووە گێژەنی بیرکردنەو ئاگای لەخۆی نەمابوو. لەسەر کورسی‌یەکی حەیزەران لەبەر دەمی‌ی دانیشتبوو و جگارەی بەدەمەوە بوو.

هەموو کاغەزەکانی خستە بەردەم و پێ‌ی ووت:

– کەس هەیە بێ‌نان و ئاو بژیێت؟!

– نەخێر.

– کەس هەیە هەتا دەشمرێت هیچ لە مووچەکەی خەرج نەکات و گشتی کۆ بکاتەوە؟!

– نەخێر.

– ئەی پێم ناڵێ‌ی چۆن تۆ ژیاویت کە هیچت خەرج نەکردبێت؟!

لەقاقای پێکەنینی داو ووتی:

– سوعبەتم لەگەڵ دەکەیت یان بەڕاستیتە؟!

– بەڕاستیمە بۆ وانی‌یە؟

بەسەر سوڕمانەوە ووتی:

– بۆ کەس هەیە بەبێ خەرجی بژیێت هەتا من دووەم کەس بم؟ وەرەقەیەکی خاوێنی ڕاکێشا بەردەمی و دەستی کرد بە ڕەش کردنەوەی و ووتی:

– مووچەکەت چەندە؟

– بە هی خۆم و منالەکانمەوە دەکاتە هەشتاو پێنج دینار.

– وا بۆم کردی بە نەوەت و دوو دینار. ئەگەر گشتی‌ی کۆبکەیتەوە ساڵی دەکاتە هەزارو سەد و چوار دینار، دوای بیست و پێنج ساڵ خزمەت دەکاتە بیست و حەوت هەزار و شەش سەد دینار. وایە یان نا؟

– بەڵێ وایە.

زیاتر لێی چووە پێشەوەو بەنەرمی‌یەوە پێ‌ی ووت:

- پرسیارێکت لێ بکەم عاجز نابیت؟

- نەخێر.

- ئەم ئوتێل و مارسیدس و تەلاب و شۆفەلەت لەکوێ هێنا؟!

لەقاقای پێکەنینی دا و هەڵسایە سەرپێ بەدەم پێکەنینەوە ووتی:

- دەڵێیم ئەوە بۆ لەوەتی بەیەکەوە کاردەکەین هەر خەریکی کاغەز ڕەش کردنەوەیت و بەچاوی گومانەوە سەیرم دەکەیت، تۆ مەڵێ زۆر خراپم تێ گەیشتووی؟بڕلات وایە من چەند ساڵە بە پارەی مووچەکەم ژیاوم؟ بۆ ئەم پارەیە بەشی گوزەران دەکات هەتا ئەوەندەی لێ پاشەکەوت بێت؟!

- ئەی لە کوێت هێنا؟

- ناکات پلێی دەستی ناپاکە! تۆ خۆت دەزانیت من کرێکارم تەنیا یاریدەی فەرمانبەرانم داوە هەروەکو چۆن ئێستاش یاریدە دەری تۆمە. جا ئەگەر من بە ماڵی دزی بوویمە خاوەنی ئەم سامانە ئەوا دەبوو ئێستا جەنابتان و ئەوانەی پێشووی تۆش حسابێکیان بۆ حاڵی خۆیان بکردبایە.

- ئەی ئەگەر پاشەکەوت نەبێت و ماڵی دزیش نەبێت، ئەی لە کوێ هات ئەم سامانە زۆرە؟!

- بە دوو تەنەکە هەنگوین و ڕاوە ماستێکی هەولێر هاتووە!!

لەقاقای پێکەنینیدا ووتی:

- ناکات گاڵتەم پێ بکەیت، ئەم سامانە زۆرە کە بەمووچەی تەمەنێک کۆنەبێتەوە چۆن بە دوو تەنەکە هەنگوین و ڕاوەماستێک کۆدەبێتەوە؟!

- بەلاتەوە سەیر نەبێت. کاتێک کە بیستم نیازیان وایە بایەخ بەهاوینەهەوارەکان بدەن و پارچە زەوی بدەنە ئەو کەسانەی پرۆژەی گەشت و گوزەرییان لەسەر دروست دەکەن. منیش کە ئەمەم بەرگوێ کەوت خێرا خۆم گەیاندە بەغداو دووتەنەکە هەنگوین و ڕاوە ماستێکم بەدیاری بۆ ئەندازیارێکی کۆنە هاوڕێم لە دەزگای باڵای گەشت و گوزار برد و ئەم داوایەشم لێ ی کرد. واسیدەی بۆکردم و پارچە زەوییەکی هەزار مەترییان بە خۆڕایی دامێ بە مەرجێ بنیاتنانی پرۆژەیەکی گەشت و گوزار. هەر هەمان ئەندازیار کۆمەڵێک نەخشەی ئامادەکراویشی دامێ و ووتی ئەم نەخشانە بە سەد هەزار دینار جێبەجێ دەکرێت بەڵام من بۆت بە دوو سەد

هەزار دینار دەخەملێنم و هەر دوای ماوەیەکی کورت سکالایەک بۆ من بەرزیکەوە و تیایدا بڵێ بەشی یەکەمی پرۆژەکەمم تەواو کردووە و داوای بەشێکی ئەو سلفەیە یکە کە بۆ ئەو پرۆژانە تەرخان کراوە. منیش پەسەندی دەکەم و باتقی زەوی و ژاریش سلفەیەکی شەش هەزاریت دەداتێ. بەم جۆرە بە چەند قۆناغێک توانیم لە هیچەوە ببمە خاوەنی ئەم ئوتێلەو ئۆتۆمۆبیل و سەرمایە.

دوای بڕینی ماوەی سەدان کیلۆمەترو بەزاندنی تخوبی چەندین وولات گەیشتە یۆنان و لەوێشەوە بە هەزار ئاین و تۆین بەرەو کەنەدا لەگەڵ گەیشتنەجێ لە فرۆکەخانە تۆڵبەستیان کرد و دایانە بنکەی پۆلیس.

زۆری بیرکردەوە چی بڵێ تاوەکو مافی پەنابەرێتی بدرێتێ... قاچاخچیەکان پێیان گوتبوو کە مافی پەنابەرێتی سیاسی بەزەحمەت کەوتووە دەڵێن کوردستان ئارامەو کورزی ڕژێمی لێ دوورە... هەروەها مافی پەنابەرێتی مرۆڤایەتیش، چونکە ولاتی ئێمە کشتوکاڵیەو بێ‌پارمەتی دەرەکیش لەگەڵێک ولاتی دنیا حاڵی باشترە...

بەدوای پاساوێک دەگەڕا بۆئەوەی مافی پەنابەرێتی مسۆگەر بکات.

پۆلیسی بنکە لێی پرسی: لەبەرچی وولاتی خۆت بەجێ‌هێشتووەو ڕووت کردۆتە ئێرە؟

هەندێک داما... دیمەنێکی ئەو فیلمە سێکسەی هاتەوەیاد کە لە ئەورووپا نێریان لە نێر مارە دەکردو نێربازیان بەرەوا دەبینی...

ڕاچڵەکی و ڕووی کردە پۆلیسەکەو وتی:

لەولاتی ئێمە ئازادی سێکسی نییە، منیش حەزدەکەم مێرد بە هاوڕەگەزێکی وەک خۆم بکەم تاکو خێزانێک پێک بهێنین بۆیە ئەم هەموو ولاتەم بەقاچاخ بڕیوە بۆ ئەوەی لەم مافەی مرۆڤ بێ‌بەش نەبم.

پۆلیسەکان سەیرێکی یەکتریان کرد و بەزەردەخەنەیەکەوە پێ‌یان ووت هەقی خۆتە تۆش ئازاد بیت و پیاوێکی ڕێک و پێک بۆخۆت دەستنیشان بکەیت و بیکەیتە هاوبەشی ژیانت.

هەر ئەو ڕۆژەی لەگشت ڕۆژنامەکانی ئەو ولاتە وێنەی ئەویان بلاوکردەوەو بە خەتێکی گەورەش لەژێرەوە نووسیبوویان ئەم مرۆڤە لەبەر ئائازادی سێکسی وولاتی خۆی بەجێ‌هێشتووەو ئێستاش چاوەڕێی هاوژینێکی وەک خۆی دەکات.

هەر بۆیەیانی دەیان پیاوی سمێڵ تراشاو قژ ژنانی و چوارشانەو حەلقە لەگوێ

رویان کردە بنکەی پۆلیسی فڕۆکەخانەکەو داوای دەستیان کرد. ئەفسەری بنکەی پۆلیس پێی ووت بەختەوەریت کە ئەم هەموو پیاوە بەجارێک داوای دەستت دەکەن. بۆخۆت یەکێکیان لێ هەڵبژێرە.

ئەیزانی چی بڵێ، بیرێکی هێناو بیرێکی برد لەدڵی خۆیدا ووتی ئەگەر ڕەفزی بکەم بە تەقلە بۆ وڵاتەکەی خۆم دەمنێرنەوە بۆیە باشتروایە دڵ لە دڵ نەدەم... ئەی ئەگەر وانەکەم پێم نالێن چۆن مافی پەنابەرێتیم دەدرێتێ؟!

دەستی خستە ناو دەستی پیاوێکی قولەڕەشی مل ئەستوور. هەر ئەوکاتە گوێی هەردووکیان کون کردو هەریەکەی حەلقەیەکیان لەگوێ کردن و هیوای خێزانێکی بەختیاریان بۆ خواستن.

هەرچەند جاری سەری بەئۆفیسی نیشتەجێ بوونی بێگانەکان دادەگرت بۆ نوێکردنەوەی مۆڵەتی نیشتەجێ بوونی، فەرمانبەرەکانی ئەو ئۆفیسە رووی خۆیان لێ ی وەردەچەرخاندو بەنابەدڵییەوە دەیانوت دیسان بێ ووڵاتەکەیە، هاتەوە!!

ئەم ووشەیەی بەلاوە لەخەنجەرێک کولتربوو، هەرچەند جاری وایان پێدەگوت بۆی بەمردنێک هەبوو.

رۆژێکیان دوا رۆژی نیشتەجێ بوونەکەی بوو، بۆ نوێکردنەوەی مۆڵەتەکەی چۆوە ئۆفیسی ناوبراو ئەمجارەشیان وەکو جارانی پێشووفەرمانبەرەکانی ئەو ئۆفیسە لەجیاتی وەرگرتنەوەی سلاو لێی گرژبنەوەو بەدەنگێکی بەرز بەیەکەوە ووتیان دیسان بێ ووڵاتەکەیە! داد لەدەستی ئەم بێ ووڵاتە!!

زۆر لێیان کۆڵداربوو

ئەم جارەیان خۆی بۆتەگیراو لێیان چووە پێشەوەو بەدەنگێکی بەرز ووتی!

ئەوە چیتانە هەرچەن جارێ دێمە ئێرە پێم دەڵێن دیسان بێ ووڵاتەکەیە. گوێ بگرن و باش بزانن. من بێ ووڵات نیم... ووڵاتی من کوردستانەو زۆر لەو ووڵاتەی ئێرە جوان و رەنگینترە. لەخۆشیانیش نەهاتوومە بۆ هەندەران، بەڵکو پەناهەندەی سیاسیم و لەبەر زەبر و زەنگی دوژمن رام کردووە ئەگەرناچاریش نەبم یەک تاکە رۆژ بەمیوانیش لێرە نامێنمەوە.

# سنگەسە

چەندین خانووبەری رێکوپێکی لەناو جەرگەی شارکڕی بوو... لەجیاتی جارێک دەیان جار دەیان گەلا دۆلاری بۆ دەزگیرانەکەی دەناردەوە...

دواجار کە هاتەوە، دەزگیرانەکەی زۆر داوای لێکرد کە نهێنی ئەم سەروەت و سامانەی خۆی بۆ بدرکێنێ، ئەویش دەیووت تۆ چیت لەم قسانەداوە، بەس ئیـیە لەسەرت تاژێر قاچەکانتم لەزێڕگرتووە.

دەزگیرانەکەی هەر لێی نەگەڕا تا هێنایە وەڵام ووتی: ئەگەر نهێنی ئەم سامانەت بۆ بگێڕمەوە قێزم لێدەکەیتەوە، ئەوەبوو وردو درشت کاروکاسبی خۆی لە هەندەران بۆ گێڕایەوە و ووتی: لەجیاتی ئەو پشتێنە زێڕەی تۆ لە پشتی دەبەستی من زنجیرێکی قولابدار لەناو قەدم دەبەستمەوەو لەبەیانییەوە تاکو ئێوارە لەبەردەمی سوپەرمارکێتێک رادەوەستم... زەبوونەکانی ئەم بازاڕگەیە گشتیان هەر لە دوورەوە دەمناسن، بەبێ پێ ووتن سەگەکانیان بەرەو لای من دێن و قولابی سەگەکانیان لە قولابی زنجیری ناو قەدم قایم دەکەن و بۆ هەر سەگێک یەک گەلا دۆلارم وەکو سەگ بۆ فڕێ دەدەن هەر بۆیە ناوبانگم لەو ووڵاتە بەسنگەسە دەرکردووە.

## ٨٥.بوو .... نەبوو



نەبوو
هەبوو
نەبوو
هەبوو
نەبوو
نەبوو
هەبوو
هەبوو
نەبوو
هەبوو
نەبوو
هەبوو

# گوزاڵدیٚ

دوای سێ ساڵ چاوەڕوانی ئەوجا لە ئێوارەیەکی درەنگدا نامەیەکی لەهاوسەرەکەیەوە بۆ هات. نامەکەی کردەوە تیایدا نووسرابوو (هاوسەری خۆشەویستم، بەهەزار فرۆفێڵ ئەوجا مافی پەنابەرێتی‌ی سیاسیم پێ بەخشرا. بۆ ئەوەی بتوانم ئێوەش ڕابکێشم دبێ هەر چۆنێ بێ خۆتان بگەیننە تورکیاو لەهوتێلێک چاوەڕوانم بکەن تا دەعوەتنامەیەکتان ئاراستە دەکەم) لەخۆشیان وەختابوو باڵ بگرێ.. هەر ئەو ئێوارەیە دراوسێکانی کۆکردەوەو گشت کەل و پەلی ناو ماڵەکەیانی هەڕاج کرد بڕێک پارەی پێکەوەنا.. پاسەپۆرتێکی ساختەکاری کڕی و بەرەو زاخۆ کەوتەڕێ. پارەی خۆت بدەو (...) لەمزگەوت دەرکە!! بەچەند گەڵا دۆلارێک لەسنور ئاودیویان کرد و لەوێشەوە هەربە پاڵدان قاچاخچیەکان بەرەو ئەنقەرەی پایتەخت بردیان. ئەو حسێبی هوتێلی (کاسب)ی بەغداو (مێرگەسور)ی هەولێرو شۆربای نیسک و ئاوی بەلاشی کردبوو نەیزانی لەوێ بەخۆشی نازانێ کەچۆن دەیبرنەوە. هەمووی چەند ڕۆژێکی نەبرد تەنگەتاوبوو.. ئۆقرەی لێبڕا.. هانای بردە بەر یەکێک لەئافرەتە خزمەتکارەکانی هوتێلەکە و داوای یارمەتی لێکرد. ئافرەتەکە ووتی زۆر ئاسانە ئەتبەم بۆ شوێنێک تێروپڕ خزمەتت دەکەن و پارەشت دەدەنێ و ئەوانیش مەمنون!! لەگەڵی ڕۆیشت بۆ باڵەخانەیەک لە نزیک هوتێلەکەی ئەوانەوە هەر لەدەرگای پرسگەوە بەڕێزلێنان بۆ سالۆنەکە کشاندیان.. دوای بەخێرهێنان پەرداخێک شەربەتی پرتەقاڵیان پێشکەش کردو هێشتان لەگەرووی نەچوبووە خوارێ سێتێک جل و بەرگی خەوتنیان بۆ هێناو بەرەو ژورێکی نهۆمی دووەمیان برد. ئەوەی دەیبینی فیکەیەکی بۆ دەکێشاو بەسەر سورمانەوە دەیووت (گوزاڵدێ) ئەویش واقی ورمابوو نەیدەزانی ئەم هەموو بایەخ پێدانە لەپای چی یەو ئەو (گوزاڵدێ)یە مانای چی یە!! لە دڵی خۆیدا دەیووت تۆ بڵێی مافی پەنابەریتی‌یان پێم نەبەخشیبێ و بەخۆم نەزانی بێ؟! دەرگای ژورێکیان بۆ کردەوەو بەجێ‌یان هێشت. لەدیوی ژورەوە دەرگاکەی ڕاپێچ کرد و جل و بەرگە نوێ یەکەی لەبەرکرد و لەسەر تەختەی نوستنەکە لێ‌ی ڕاکشا... چاوەکانی لەسەر یەک دانا... هێشتا بەتەواوی خەو نەچووبووە چاوەکانی

کەلە دەرگـایان دا. لەدڵی خـۆیدا ووتی تۆ بڵێی شـتـێکی تر مـابێ پێشکەشم نەکرابێ؟! دەرگاکەی کردەوە.. چوار فیتە زەلامی زەبەلاح لێی بەژوورکەوتن.. کابرای پرسگەو خزمەتچی هوتێلەکەش لەپێشەوەیان بوون و بەدەست ئیشـارەتیان بۆ کردو بەتوورکیش پێیـان ووت (گوزاڵدێ). ئەویش هیـچی لێ نەدەزانی و نەبلـەق مابوو.. چوار زەلامـەکە سەریان لە جـوانیی سـوورِ مـابوو.. هەر چوار بەجارێک فـیکەیەکی درێژیان کێشاو بەیەک دەنگ ووتیان (گوزاڵدێ)!! ئەمەیان ووت و هەنگاو هەنگاو لێی چوون پێشـەوە.. بەقـەد تاڵە مـویەک مابوو بیگەنێ...دڵی وەک گوونی سەگ لێی دەدا.. لەترسـان ڕەنگی وەک پەلکی پیـاز سـپی هەڵگەڕابوو.. لەدڵی خـۆیدا ووتی ئەم (گـوزاڵدێ) یەو ئەم هێلکە و ڕۆتە زەبرە قـونێکی تیـایە.. ناوی خـوای لێهێناو وەک تۆنترەقە بۆی دەرپەڕی یە دەرەوەو ئەوانیش وەک تاژی بەدوایەوە..

# ماران گەستی لەخشپەی مار دەترسێ

هەرچەندە چیرۆک و کورتە چیرۆک و ڕۆمانەکانم زادەی بیرو ئەندێشەی خۆمن و منیش بوونەوەرێکی ئەم واقیعەم و خەیاڵەکانیشم بەشێکن لەم واقیعەو لێ ی بەدوورنین بەڵام سەرەڕای ئەمەش تاکو ئێستا چەند جارێک گیروگرفتم بۆ دروست بوودو کەسانێک کەسایەتیەکانی ناو بەرهەمە ئەدەبی‌یەکانی منیان داوەتە پاڵ خۆو بەناو زڕانیان لەقەڵەم داوەو داوای قەرەبوویان لێ کردوومە بۆیە ئەوەکا خوانەخواستە دوای بڵاوبوونەوەی ئەم بەرهەمەشم کەسانێکی ترم لێ ڕاست بنەوەو تاقەتی ئەم هەموو سین و جیمەم نیەو فلسێکی سووریش شک نابەم تا قەرەبووی ئەم جۆرە کەسانەی پێ بکەم بۆیەکا بەپێویستی دەزانم بۆ گشت خوێنەرانی خۆشەویست ڕابگەیەنم کە کەسایەتی چیرۆکەکانم دەستکردی خۆمن و کەسێکی دیاری کراونین.

ژمارەی سپاردن (٢٣٧) ساڵی ١٩٩٨

لە چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر چاپکراوە